# [ رابەری بەندەکان ]



وەرگیری بو کوردی



ماموستا

مەلا عبداللّەی مەلا عبدالرحمن گناوی - پشدەر

ئیمامی مزگەوتی میرزا رۆستەم

چاپی - سێهەم

لە سەر ئەرکی
مەلا عبدالرحمن کوری دانەر
لە چاپ دراوە

١٤١٠ هـ        ١٩٩٠ ز

چاپخانەی شەفیق - بەغدا

# [ رابەری بەندەکان ]

## وەرگێڕی بۆ کوردی

## مامـــوستا

### مەلا عبداللەی مەلا عبدالرحمن گناوی ـ پشدەر

ئیمامی مزگەوتی میرزا رۆستەم

چاپی ـ سێهەم


**لە سەر ئەرکی**

**مەلا عبدالرحمن کوری دانەر**

لە چـاپ دراوە

١٩٩٠ ز ١٤١٠ هـ

چاپخانەی شەفیق ـ بەغدا



ملا عبداللّه ملا عبدالرحمن امام وخطيب ومدرس
لەمزگەوتی میرزا روستەم

وی را عفیاو نی ئەمنش بەرنەوە ئەوجێگایە پێغەمبەرەوە فەرمویە خوا دەفەرموی ای ابن آدم
اگر از دعا دەس بکی و رجام لی بکەی لیت خۆش دەبم و باکم نیە ای ابن آدم اگر گناهی تۆ بگاتە
نیزیکی آسمان لە پاش ئەلیم بە پاریەوە لیت خۆش دەبم ای ابن آدم اگر بەپری ارض گناهت
هەبی لە پاش ئەلێبای بە پاریەوە ئەمنش بەپری ارض رحمت بەسرا دابارێنم ولیت خۆش
دەبم پێغەمبەرەوم فەرموی اگر آرەزوتان هەیە بیتیان دەلیم اول قصیک کە خوا بەمسلمانان
دەفەرموی دە روژی قیامت را اول قصیکی کە عبدی لی دە خزمت خوای را حازرە
فەرموی ای بیتیان خۆشی لە لقای من عرض دەکی بلی دەفەرموی بۆچی عرض دەکی چونکە
ولقای
رجای عفوی تۆ و لی خۆشی بونی تۆمان هەبو خوا دەفەرموی ئەوە واجبم کرد عفو ولی خۆشی
بونی خۆم ولقای خۆم حلالانم ایوە بلین وەبەرنگی صاف وساغ بە پارمنیەوە کە ایمە رجای
عفو ولی خۆش بونی ولقای تۆمان هەیە دنیا دەگرین بەدەمی تۆ دورتی تۆ دنیا دەگرین
بە عفوی تۆ لە عذابی تۆ ای خوا بەسە ایمە طلب دەکین لە تۆ کە آسودە بین بەو دنیا وقیامت
را ولیمان نەستینیەوە ئەو نعمتی ایمان کە پیت عطا کردین وە دلمان رش نەکە لە پاش ئیمان
[illegible] وطلب [illegible] تمان بکە بەو عملەکە رضایتی تێدابێ وە نەگری رانیی خۆمان بە خۆر
[illegible] دەگل ئەوکەسانە کە نعمتی خۆت داوە وکو پێغەمبەر و خۆشەویست وشهید و
پیاو صالح بن و امینی بکە لە نارحتی روژی قیامت وسیبرانی بکە دەژیر سیبەری خۆت
دا دەروژێکدا کە هیچ سیبەر نیە الا سیبەری تۆ نەبی وە بەنصیبمان بکە بە جنت بەبی حساب
وتمات کردن بەزانی گەورەی خۆت سبحانە وتعالی وصلی الله علی سیدنا محمد النبی الامی وعلی
آلە وصحبه وسلم وآخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمین تەواو بو ترجمە ارشاد العباد بە صورتی
مختصر منتا بو برادران عاجزی پیدا نەبی لە سرطلبی برای محترم هاوکسی حسین رجا لە برایانی
دینی اوە بە هەر کەس تماشای کرد وعیبی کرد بە چاوی مرحمت لی بپوشن وکسی بە اصلاحی
بکا و بە دل سوزی دعامان بو بکا وصلی الله علی سیدنا محمد تاریخ تەواو بونی لەو نوسراوە

٥ ی رمضان
١٣٧٦ هجری

ولكل درجة اربع دقايق نو ولهذا الان كل ساعة ستون دقيقة ونسبة خمسة عشر الى م

ستين كنسبة الواحد الى الاربعة مسـ فاذا مضى من نصف النهار بقدر ما معك

من الساعات والدقايق ان زاد طول البلد نو ان زاده بان كان شرقيا عن مكة

شرفها الله تعالى لان الشمس تصل الى نصف نهار الشرقي قبل وصولها الى نصف نهار الغربي مسـ

اوبتوله بقدر ما ان نقص فظل المقياس ح خط سمت القبلة نو ا خطاه لان

دائرة ارتفاع الشمس ح تمر بسمت راس البلد ومكة معا شرفها الله وان الله اي سطحها الاعلى اذ منه

من الطرف المغرب اي

وهي الى خلاف جهة الظل هذا ما غفلت عنه عوايق الزمان ولم ينتبه

من القياس ان

له طوارق الحدثان والحمد لله رب العالمين

الحمد لله رب العالمين والصلوة والسلام على سيدنا محمد واله وصحبه

اجمعين قد وقع الفراغ من تحرير هذا الكتاب المسمى بتشريح

الافلاك على يد اضعف العباد المحتاج الى

عفو ربه الملك العباد عبد الله

الكاوي ابن ملا عبد

الرحمن بالله

بالله

## « پێشەکی »

بسم الله الرحمن الرحيم الحمد لله رب العالمين وصلى الله على سيدنا محمد وآله وصحبه والتابعين له الى يوم الدين ، سوپاس بۆ خوای گەورە کەلە هەموو چەرخ و زەمانێکدا زانایانی کردووە بە چرای ڕوناك کردنەوەی ڕێگـەی بەختیاری بۆ ئادەمیزاد، بەتایبەتی زانایانی ئایینی کردووە بەمایەی کامەرانی هەتاهەتایە بۆ موسوڵمانان لەدوای پێغەمبەران ، وەپایەی ( العلماء ورثـة الانبيـاء ) پێ بەخشیون لەسەر زمانی حەزرەتی محمد (ص) پێشەواو ڕابەری ئیسلام ، وە پلەی پارێزگاری ئیسلام و قـورئانی پیرۆزی پێداون کـەلە قورئانا بەڵێنی داوە و فەرموویەتی (انا نحن نزلنا الذكر وانا له لحافظون ) بەڕاستی کـە ئاوڕێك بدەینـەوە بۆرابردوو ومێژوو بۆمان ڕوون دەبێتەوە کەئەم کۆمەڵە زانا ئایینیانەی ئیـسلام چەند کۆششیان کردووە و خۆیان بەخت کردووە لەڕێگـەی پارێزگـاری ئیـسـلام بەفەرمان بەچاکە و نەهی لەخراپەو سڵ نەکردنەوە لەهیچ بـوارو زرووفێکـدا بۆ بەجێ هێنانی فەرمانی خوا لەئایەتی « ولتكن منكم امة يدعون الى الخير ويأمرون بالمعروف وينهون عن المنكر وأولئك هم المفلحون »... دوهەم لەڕێگەی مانادانەوەی قورئان و کۆ کردنەوەی فەرمایشتەکانی پێغەمبەر (ص) وەدەر هێنانی ئەحکامی پێویست بۆ موسوڵمانان لەودوو

چاوگەیە لەسەر رێبازی دەستوورەکانی عیلمی (أصول الفقه) ..
سێهەم‌بەرێک‌خستنی دەستوورەکانی عیلمی بلاغە ونحو وصرف
وأصولی فقەو اصولی حدیث و اصولی تەفسیر کەهەموویان خزمەتی
قورئان دەکەن‌و اعجازی قورئان دەسەلمێنن ... جالەو بوارەدا زانایانی
ئیسلامی هەموو میللەتێک بەشداریان کردووە هەر لە سەرەتای
ئیسلامەوە تائێستا .. وەزوربەی زانایانی میللەتەکان بەشی زۆری
پێویستیەکانی ئاینیان وەرگێراوەتە سەر زمانی زگ‌ماکی میللەتی
خۆیان بۆئەوە بەئاسانتر تێی بگەن ـ بەلام زانایانی ئیسلامی گەلی
کورد زۆریان گرنگی نەداوە بەلایەنی وەرگێران بۆسەر زمانی
میللەتەکەیان لەبەر ئەوەی ویستوویانە ئەحکامی دین لەچاوگەی خۆی
وەرگیرێت‌و مەجالی گۆرین (تحریف)ی تێنەکەوی ـ ۲ ـ نەوەك
ئەوانەی شارەزایی تەواویان نیە لەئاین ببنە جێی پرسیار لێ کردن
(مرجع) ۳ ـ رێزمانی کوردی وئیملای کوردی نەبوە ، ـ ٤ ـ
کاربەدەستانی ئەو سەردەمە رێگەیان نەداوە لەزۆر ناوچە
کانی‌کوردستان ، لەگەل ئەوەشدا لەزوربەی چەرخەکاندا تاك
تاکە پەرتووکی ئاینی لەلایەن هەندێک زانایانی ئیسلامی کورد
دانراون یاوەرگێرراون لەزمانی عەرەبی بەلام لەبەر ئەو هۆیانەی
سەرو گوێیان پێ‌نەدراوە یەکێك لەوزانا ئاینیانەی کەشەیدای زمانی
کوردی بوون‌و ئاواتیان بوو هەموو زانستێک بەزمانی کوردی
لە نامە خانە کاندا ببێ باوکی رەحمەتیم‌بوو بەلام چەند هۆیەك ماوەی
ئەو ئیشەیان نەدەدا وەك خەریک بوون بەدەرس ووتنەوەی فەقێ‌و

خەریک بوون بە کاسبی کشت و کاڵ چونکە زوربەی زیانی بە ماندووبوونی دەستی خۆی پەیدادەکرد ، وەخەریک بوونی بە میوانداری وریك خستنی کێشەی نێوان خەلک وشەرع کردنیان بەپێی فیقهی ئیمامی شافعی-چونکە ئەو کات زوربەی موسوڵمانان باش مەلای ناوچەکەیان دەکردە (حکم) بۆ ڕێکخستنی کێشەکانیان لەجیاتی (محکمە) •لەگەڵ ئەو هەموو بەرپەرچانەش کتیبی حەدیثی (ارشاد العبد)ی (زین‌الدین‌ابن‌عبدالعزیز)قوتابی شێخی ابن حجر وخاوەنی کتابی (فتح‌المعین)ی فیقهی شافعی کە ئەو کات زوربەی مەلایانی ناوچەکە ئەویان‌بۆموسوڵمانان دەخوێندەوە پاش وێژی عەسران وخەوتنان وبەتایبەتی شەوانی‌سێ‌شەممەوجومعە،وەپێش نوێژی‌جومعە لەجیاتی قورئان خویندن ، وەری گێڕایە سەر زمانی کوردی ، بەڵام بەکورتی ولا بردنی چیرۆکەکانی چونکە دەی ویست لەچاپی‌بدا ، وەتواناى زۆر کەم بوو ، لەکۆتایشدا هەر بۆی نەکرا لەچاپی بدا تاکو وەفاتی‌کرد ، ئەو جار من لە ساڵی ١٩٦٥ م لە چاپم دا ، وەلەساڵی ١٩٧٢م‌بۆ دووەم جار لە چاپ درایەوە لەلایەن (حاجی حسن فتاح) خاوەنی مەکتەبەی غەزالی لە سلێمانی ، بەڵام زۆر بە نارێکی و لە جیاتی‌وێنەی‌وەرگێروێنەی‌خۆی‌لەپشتی‌دابوو وناوی‌خۆ نووسیبوو، ناوی وەرگێر نەنوسرابوو ، وە زۆر لە موسوڵمانان پێش نیاریان کرد کە بۆ سێهەم جار لە چاپی بدەمەوە بەڵام لەبەر ئەوەی پەڕتووکی ئایینی بە کوردی لەم دوایەدا زۆر بوون بە پێویستم نەزانی کە سێیارە ( ڕابەری‌بەندەگان) لەچاپ بدەمەوە تاکو بە خزمەت جەنابی

(مام وەستا عبدالكريم)ی مدرس گەیشتم فەرمووی دەبێ ئەو تەرجەمەی (ارشـاد العبـاد) ەی باوكـت لەچاپ بدەیەوە ، وە لەئێستاوە دەبێ خەریك بی ، جادوای فەرمانی مامۆستا دڵم هاتە سەر چاپ كردنەوەی بەتایبەت كەلەلای (مامۆستا سید بكر سید غەریب) بابەتەكەم باس كرد زیاتر هانی دام ووە عدەی پێدام كەهەموو جۆرە یارمەتیەكم بدا لەو ڕێگەدا ـ خوا بیپارێزی ـ بڕیاری تەواومدا بۆ گەیاندنەوەی بەچاپ ، ئاواتە خوازم موسوڵمانان زیاتر سوودی لێوەرگرن ، وەدوعای چاكە بۆ هەموومان بكەن ، وەهیوا دارم دانانو وەرگێڕانی پەرتووكی ئایینی بەزمانی كوردی زیاتر لەگەشە دابێ لەلایەن زانایانی ئایینی كوردەوە ، چـونكە تائیـستا نامەخـانەی كـوردی زۆر پێویستی ماوە لەلایەن پەرتووكـی ئایینیەوە ، وە پێموایـە ئـەم پەرتووكەش جێگەیەكـی دیاری كراوی پڕ كردۆتەوە لە پەرتووك خانەی كوردی ، وەبەپێویستم زانی كە نموونەیەك لە زیانی وەرگێڕتان بخەمە بەرچاو لەگەڵ نموونەیەك دەستنووسی پەرتووكـە كەو دەستنووسی نووسینی عەرەبی لەكتێبی (تشریح الافلاك) لەلایەن وەرگێڕەوە .

عبدالرحمن عبداللہ عبدالرحمن

كوڕی وەرگێر

ئیمام وخطیبی مزگەوتی عمر بن

خطاب ـ لە گەڕەكی ٧ ی نیسان ـ

هەولێر ١٦ای ڕەجەبی ١٤٠٧هـ

١٩٨٧/٤/١٤

## « وەرگێڕ لەچەند دێڕێکدا »

ناوی مەلاعبداللە کوڕی مەلا عبدالرحمن کـوڕی مەلا محمـد کوڕی مەلا ڕەسوول تاکوو حەوت پشت زانراوە کە مەلا زادە بوون وخەڵکی گوندی گەناون لە ناوچەی پشدەر لە خوارووی ڕۆژهەڵاتی قەڵادزە لە پارێزگای سلێمانی ، لەگوندی بادەڵیان نزیک قەڵادزە لـە دایک بوە کەوباکی مەلای ئەوێ بوە لە ساڵی١٣٢٦ی کۆچی ١٩٠٧ی زایینی وەباوکی بە ناو حاجی مەلا عبداللە جەلیزادەی کۆیەی کردۆتەوە چونکە بۆخۆی زوربەی خوێندنی لەلای ئەوبووە و ئیجازەشی لەخزمەت وەرگرتوە وەلەپشتی کتێبی (رسالـة الحساب) ،کەی نووسیویەتی : (سمیتە عبداللە احیاء لاسم استاذی جلیزادە جعل اللە لە الحسنی والزیادة ) • ئەوجار باوکی کۆچی کردوە بۆشاری مهاباد بە مەلایەتی لەسەر مزگەوتی سید نیزام دامەزراوە تاکو شەڕی جیهانی یەکەم بەدەستی ڕووسەکانی قەیسەری شەهیدبوە ، حاجی مەلا عومەری واشەمەزینی باوکم و مامم(٢)وپلکمی تاکو بوهار هێناونە لای خـۆی لە گـرانیەکەدا بەخێوی کـر دوون ، ئەوجـار

---

(٢) ناوی مەلارەسول بووە وبرا گەورەی بووە باوکی ملا محمدی چوارقورنەیە •

ناردوونیەوە جێگەی باوکیان گوندی گەناو ، باوکم دەستی کردوە بە قورئانی پیرۆز هەموو ڕۆژ بۆدەرس چۆتە گوندی (قەدۆڵ) لای مەلا مصطفی یوسف لە دوایی چۆتە ناو فەقێیان لەچەند مەدرەسەیەک خوێندوویەتی تاکوو بۆتە موستەعید چۆتە لای مەلا محمد کوڕی شێخ ئەمینی بێژوێ وەچەند دەرسێکیش لەخزمەت شێخ خوێندوە ، دوایی چۆتە لای مامۆستا مەلا محمدی دەڵگەیی لە گوندی گەرمکان(٥) کەباش مەلای ناوچەی پشدەربوە ماوە یەکی زۆر لەلای ماوەتەوە ، دوایی چۆتە لای مامۆستا مەلا محمدی رەئیس لەگوندی گەلاڵەی لای ماوەت تاکو ئیجازەی لە لا وەرگرتوەو بۆتە مەلای گوندی گەناو لە جێگەی باوکی بەڵام دوای دووسێ مانگ لەوێ ڕۆیشتوە چۆتە گوندی گەرمکان(٥) وەمن لەو گوندە لەدایک بووم لەساڵی ١٣٥٦ی لەدوای چەند ساڵێک چۆتە گوندی پێورانی سەرو دوایی بۆتە مەلای گوندی ئەڵاس ئەوجار گوندی پێمالک تا لە ساڵی ١٩٥٠م چۆتە میرزاروستەم مەرکەزی ناحیەی چناران سەر بە قەزای ڕانیە ، بە ڕاستی لەوێ تەدریسێکی زۆر بە تەواوی کرد هەموو کات دەبازدە فەقێ لە مەدرەسەی بوون وەخەڵکی میرزاروستەمیش زۆر باش بە خێویان دەکردن وەهەرساڵە ئیجازەی مەلایەتی دەدا بە موستەعیدێک لە وانەی خوێندنی مەلایەتی ئەوکاتەیان تەواو کردبوو ، وەک :

---

(٤) لای کاکە ملای حزمی ملا عمری واشتەمەزینی وەئەو لای داناوە لەبەر بچوکی .

یەکەم : مەلانجم الدینی لاجانی ۲ ـ مەلا عبداللە ی حاجـی بایـزی مامەش ۰ ۳ ـ مەلا حسن مەرگەیی ۰ ٤ ـ مەلا حسینی شێنیەیی ۰ ٥ ـ مەلاموسیی شوانجـارە ۰ ٦ ـ مەلا رەسوولی شارستێنی ۰ ۷ ـ مەلا قادری یاخیانی ۰

تاکـوو لـە سالی ۱۹۵۸م سدی دووکان تەواو بوو گونـدی میرزاووەستەم لە گەڵ نزیکەی (۷۰) گوندی تر کەوتە ژێر ئاوی سەدی دووکان ، میری تیمەی لە چوارقورنەی پیتوێن لەنزیک رانیە نیشتەجێ کرد ، لەبەهاری سالی ۱۳۷۸ی ک ۱۹۵۹ی ز باوکم ماڵ ئاوایی یەک جاری کردوو یەکەم کەسی بوو لەوێ تووشی مەرگ بوو گۆڕستانی چوارقورنە بەو دانرا ئیستا گۆڕەکەی زیارەتگایە ، وەسیەتی بۆ من ئەوەبوو فەرمووی قەت دەست لە مەسلەکی مەلایەتی هەڵمەگرە شەرافەتی دین ودینای تێدایە ، جا لەسەر ئەو ئامۆژگاریەی ئەو من ساڵێک وشەش مانگ چوومە ناو فەقێیان لای مامۆستا مـەلا ئەبوبەکری بۆسکێنی ومامۆستا مەلا محمدی باڵەیی لـە قەڵادزە ئـەو خوێندنەی ما بووم تەواوم کرد خوا پاداشیان بداتەوە ، وە ئیجازەی مەلایەتیم لە قەڵادزە وەرگرت لەمامۆستامەلا محمدی باڵەیی ، وەلـە چوارقورنە لەجێگەی باوکم دەستم کـرد بەئیمامەت وخـەطابەتو تەدریس ۰

عبدالرحمن کوڕی وەرگێڕ

# « پێشەکی »

کاتێ چاوم‌خشیان بەپەرتۆکەکەی مامۆستاو زانای ئایینی خوا لێ خۆش بو «مەلا عبداللّەی مـەلا عبدالرحمن کەناوی ـ أشدەر » کە پەرتوکی : (ارشاد العباد) ی وەرگێررا بۆ کوردی ، بە راستی‌کارێکی پیرۆزو رەوایە ئاکەچەند ساڵ لە مەوبەر ماموستا ئاینیی یە کانمان بیریان لێ‌کردۆتەوە کە کۆشش بکەن بۆ خزمەتی زمانەکەیان ، جا بە راستی مامۆستای ناوبراو ئەرکێکی زوری کێشاوە تا ئەم فەرموودانەی پێغەمـەر (درودی خـوای لەسەر بێ گۆرریویە بۆکوردی بۆ ئەوە کە گەلەکەی سوودی تەواوی لێ وەرگرێ (وە لە ساڵی ۱۳۷۲ هـ) تەواوی کردوە بەلام لە بـەر بێ دەست مایە بۆی لە چاپ نەدراوە ، لە کاتی وەرگێرانی ئەم پەرتۆکە لە (میرزا روستەم) ئیمام و مدرس بوە ئێستا بە رەحمەتی خوا چووە ، لە بیتوینەلە پچوار قورنە .

جا پێ ویستە لە سەر هەموو مامۆستایەك بۆ ئـەوەی کە ئەو جۆرە پەرتوکانەی کەکەڵکی لێ وەر ئەگیرێ وەری گێرنە سەر زمانی‌کوردی تاوە کوهەموو کور دێك بتوانێ سودی لێ وەربگرێ ، وە لە کانگای دڵمانەوە زۆرسوپاس و ئافرین‌ زبایی لە «مەلا عبدالرحمن»ی کوری مامۆستای ناوبراو ئەکەین . کە بوە بە هۆی چاپ‌وبلاوبونەوەی ئەم پەرتۆکە ئایینی‌یە بە ارخ وآبرۆزە .

سەنگاوی

مەلا عبدالقادر فرج

۱۹٦۱/٦/۲۸

بسم الله الرحمن الرحيم

والصلواة والسلام على خير خلقه محمد وآله اجمعين

قال الله تعالى مانای خوای گەورەو میهرەبان فەمویەتی «یا ایها الناس اعبدوا» بە مانای ئەی خەڵکی دونیا خوا بە یەك بناسن «ربکم الذی خلقکم والذین من قبلکم لعلکم تتقون» وە ئەو خوایە خوایەکی وایە کە ئێوەی دروست‌کردوە وە ئەو کەسانەی دروست‌کردوە کە لە پێش ئێوەدا بوون بویەخوای وابناسن هەتا خۆتان بپارێزن لە ئازاری خوایی ، چونکە ئینسان کە فکری خوای لە دڵ دا نەبێ لە ئازار و عەذاب ناترسێ «الذی جعل لکم الارض فراشا والسماء بناء وانزل من السماء ماء فأخرج به من الثمرات رزقا لکم فلا تجعلوا لله اندادا وانتم تعلمون» بە مانای خوایەکی وا کە کە زەوی گێڕاوە بۆ ئێوە بە فەرش ماندوی خۆتانی لێ بحەسێننەوەو ئاسمانی گیراوە بە خانوی ئێوەوە بارانی لێ دە بارێنێ وە بە هۆی ئەو بارانەوە هەمو مێوە هاتێکی بۆ ئێوە دەکا بە رزق ، کەوابو ئێوە هیچ هاوبەش‌بۆ خوا پەیدا مەکەن وە باوەڕو عەقیدەتان وابێ کە خوا یەکەو ئێوەش ئەزانن کە هەرخوا خالقەو کەس کیش‌شتی پێ نەکرێ خوا نی‌یەحەق تعالی ئەفەرموێ «ومن لم یؤمن بالله ورسوله فانا اعتدنا للکافرین سعیرا» مانای ئەوەی باوەری بە خواو پێغمبەری خوا نەبێ بە تەزاوی ئازاری دۆزەخمان

بۆئامادە کردوە ، وەرگیراوە لە ئیمامی موسلم لە حەزرەتی ئیما می عومر (رض) درودی خوای لە سەر بێ ئەی فەرموو وەختێك لە خزمەت پێغمبەر «ص» دانیشتبوین رۆژێك لە ناکاو پیاوێك بە خێرایی هات بەرگیکی سپی لە بەردابوو مووشی زۆر رەش بوون وە هیچ نیشانە یەکی سەفەری پێ وە دیار نەبوو وە ئێمە هیچمان نەمان ئەناسی هەتا هات وە لە خذمەت پێغەمبەر دانیشت وە ئەژنوی بە ئەژنویی پیرۆزیەوە نا وە دەستی لە سەر ڕانی پیرۆزی دانـاو پێی وت یامحمد خەبەرم بـەرێ و پێم بلێ ئیسلامـەتی چی یە ؟ ؟ فەرموی ئیسلامەتی ئەوەیە بە دڵ و بە زمان باوەڕبکەی کـــە بێجگە لە خوای گەورە خوایەکی کە نی یە وە بە معلومی «محمدالمصطفی» (ص)پێغەمبەری خوایە وە پێنج فەرزە نوێژ بە جێ بێنی و ئەدای زەکات بکەی وە رۆژوی رەمەزان بگری و حەجی «بیت اللە» بکەی ئەگەر مەسرەفی رێگات هەبێ پیاوەکە ووتی یا محمد خەبەرم بەرێ «ئیمان» چی یە ؟ پێغمبەر «ص» فەرمووی ئیمان ئەوەیە کە باوەڕت هەبێ بە بوونی خـواو بە مەلائکەت و بەو کتێبانە کە خوا ناردونیە خوارە وە بۆ سەر پێغەمبەران وە باوەڕت ببێ بە رۆژی قیامەت وە بە قەزاو قەدەر چ شەرر بێ و چ خێر بێ بە ئەمری خوای دێتە جێ پیاوەکە ووتی راست ئەکەی وە ووتی یا محمد خبرم بەرێ «احسان» چی یە ؟ فەرمووی احسان ئەوەیە خـوا بپەرستی وا بزانی کە چاوت لە خوایە ئەگەر تۆش چـاوت لێ نەبێ پێت وابێ خوا چاوی لە تۆیە لە پاشان پیاوەکە ووتی رۆژی قیامەت کەی دێت فەرمووی من لە تۆ چاتر نازانم وە عرضی کرد نیشانەی رۆژی قیامەت چی یە وەلامی داوە فەرمووی نیشانەی ئەوەیە کـە ئینسان گەورەی خۆی

بەولد دێنێ ، بە مانای ئەوەی کە دایكو باوك رۆڵەکانیان هیـچ گوێیان پێ نادەن وە پەیرەوی قسەکانیان ناکەن وە لە خۆیان بەکەمتر تەماشایان ئەکەن ، .. نیشانەیەکی کە ئەوەیە ئەبینی ئەوکەسانەکە فقیرو رووت بوون مشغول دەبن خانوی بلندو زۆر دروست ئەکەنو وە دەبنە خاوەنی ئازەل . لە پاشان پیاوەکە رویشت وە ئیمەش ماوەیەك قسەمان کرد لە پاشان پێغمبر «ص» فەرمووی یا عومەر ئەزانیت کێ بوو ئەوەی ئەو پرسیارانەی کرد فەرموی خواو پیغمبەری خوا لە هەمووکەس باشتر ئەزانن پێغمبەر «ص» فەرموی ئەوە جبرائیل بو هات بۆ ئەوەی ئێوە فێری دەستوری پرسینی دیانەت بکا ، وە ئەی موسڵمانینە بزانن کە اتفاقی عولەماو ئەهلی حەدیث لە سەر ئەوەیە کەسێك بە دڵ باوەڕی هەبێو بە سەرزاری باوەڕی پێ نەکا بەڵکو بە دڵ ئیمانی پێ هەبێت وە ئەو کەسانەی هـــەر بـــە سەرزاری ئیمـــان دەهێنن شوێنیان دۆزەخەو هـــەتا هـــەتایە ئـــەوە شوشوێنیان ئەبێت ، وە پێ ویستە انسان بزانێ باوەڕ بە خوا مانای ئەوەیە کە ئیمانو باوەڕت هەبێت کـــە خوا یەکە وە وێنەی نی‌یە وە هیچ شێوە نی‌یە لە شێوەی وە هیچ زاتێك نی‌یە لە وێنـــەی وە هاوکاریشی نی‌یە لە کـــاریا وە خوایەتی لایق و پەسەندە هەر بە خۆی بۆ ئەوەی عبادەتی بۆ بکرێ وە باوەڕی پێ بکرێ کە لە وێنەی پەیدا نەبووەو هەر ئەمێنێ وە نەمان و نەبونی بۆ نی‌یە وە بە سەریدا نایە وە هەموو شتێك ئەزانێ و ئاگاداری هـــەمو کارێکە وە دەستەلاتی هەمو شتێکی هەیە وە هەموو شتێك ئەبینی و گوێی لە ووتەو قسەو نیازی هەمو کەسێکە بەبێ گوێی ظاهری ، وە وەکو ئێمە خـــاوەن

لەش نی‌یە وە چۆنێ تی خوایەتی هیچ کەس نای‌زانێ • وە باوەڕ بە
ملائکەت مانای وایە کە قەدرگیراون لە خزمەت خواو بێ ئەمری ناکەن
وە هەرچی ملائکە بی‌گێرنەوە راستە وە نەنیرن و نە مێن وە باوەرر بە
کتیبەکانی خوا مانای ئەوەیە کە پێت وابێ کە ئەو ووتانە کۆنن وە
فەرمایشی خوان وە ئەو ووتە پیرۆزانە وەك قسەی ئێمە نین وە ماندیان
هەموو حەقن خوای گەورەو میهرەبان ناردونیە خوارەوە بۆ سەرهێندێك
لە پیغمبەران یا بە لوحە نیراونەتە خوارێ یا بە هۆی زمانی پاکی
جبرائیل • وە •

وە باوەڕ بوون بە پێغمبەران مانای وایە کە ئیمان و باوەڕت وابێ
کە خوا ناردوونی بۆ سەر ئەم گێتی‌یە و خوا ئەو پێغمبەرانەی دور
خستۆنە وە لە هەموو عەیبێك نەگوناهی چوکیان بووە نەگناهی گەورە
لە پێش پێغمبەریەتیداو پاش پێغمبەریەتیش •

وە باوەڕ بە رۆژی قیامەت ئەوەیە باوەڕت هەبێ کە رۆژی قیامەت
پەیدا ئەبێ وە باوەڕت هەبێ هەرچی لە پاش مردن بە سەر انسان دێت
هەقە وەکو پرسیار کردنی مەلائکەتان لە گۆڕدا وە ازاری گۆڕو
زیندوبونەوە و حساب‌کردنی روزی قیامەت تەرازوی خیرو و شەڕ و
پردی سیرات «صراط» و بە هەشت ز دۆزەخ ، وە باوەڕ بە قەزاو قەدەر
مانای ئەوەیە هەرشتێك خوا قەراری دابێ بێ ویستە هەر ئەبێ ببێ و
هەر شتێك خوا قەراری نەدا بێ بە هیچ جۆرێك نابێت •

وە خوا بۆ خۆی قەراری چاکەو خراپە ئەدا ، وە ئیمامی ئەحمەد

حاکم گەیاندویانە لە حەزرەتی ابو هریرە کە پێغمبەر «ص» فەرموی ئەی موسڵمانینە ئیمانی خۆتان تازە بکەنەوە ، عەرزیان کرد چۆن ئیمان تازە بکەینەوە فەرموی مانای زۆر ووتەی «لا اله الا الله» بڵێن .

وە (مسلم و بخاری) گەیاندویانە لە (عوسمانی کوری مالك) کە ذاتی حەق تعالی حەرامی کردوە دۆزەخ لە سەر کەسێك کە ووتەی «لا اله الا الله» بڵێ وە مەرامیشی رەزابوونی خوابیت . وە ابن عساکر گەیاندویەتی لە حەزرەتی ئیمامی علی «ع» کە پێغمبەر «ص» فەرموی جبرائیل خەبەری پێ داوم کە خوا فەرموی ووتەی «لا اله الا الله» قەلاتی منە کەسێکی بێتە ناو ئەو قەلاتە ئەمین ئەبێ لە ئازاری من . طبرانی گەیاندویەتی لە «ابو الدرداء» هەر بەندێك سەدجار «لا اله الا الله» بڵێ خوا زیندوی ئەکاتەوە لە رۆژی قیامەت دا و روخساری وەکو مانگی چواردە ئەبێ وە هیچ کەس کاری وەك ئەم کارە گەورە نی‌یە مەگەر ئەو کەسە کە ئەوەندەی ووتبێ یا زیاتر . ترمذی و نسائی گەیاندویانە لە جابری کە گەورە ترینی هەموو ذیکر «لا اله الا الله» یە و وە گەورەترینی هەمو دوعایەك «الحمد لله» یە وە هەر وەها نسائی گەیاندویەتی لە ابو سعیدی خدری کە پێغمبەر «ص» فەرموی حەزرەتی موسی فەرموی ئەی خوایە فێرم کە شتێکی وا کە تۆم پێ بکەوێتەوە بیر فەرموی «لا اله الا الله» بڵێ حەزرەتی موسی فەرموی ئەی خوایە هەمو بەندەی تو ئەوەی لەفکرەو ئەو ذکرە ئەزانن ، من شتێکم ئەوێ هەر تایبەتی بۆ خۆم بێ خوا فەرمووی یا موسی ئەگەر هەر حەوت آسمان هەرچی لە واندایە غیری من

وە تەواوی زەوی پڕبەلایەکەوە ووتەی «لا اله الا الله» لایەك بێ گران
تر ئەوەستێ ابویعلی گەیاندویەتی لە حەزرەتی ابو بکر ئەی فەرموو
پێویستەخۆتان تەراری بدەن «لا اله الا الله» وە پارانەوە لە خوا چونکە
شەیتان ووتویەتی من خەڵکی دونیام بە هیلاك بردوون بە گناه پێ کردن وە
ئەوانیش منیان هیلاك کردوە بە ووتنی«لااله‌الاالله» بە پارانەوە شەیتان ئەڵێ
جا ئەو جار هەواو هەوەسیان بۆ پەیدا ئەکەم وە عالەمیش پێی وادە بێ
کە لە سەر ئیش باشن ، حەزرەتی ابو هریرە رەزای خوای لە سەر بێ
فەرموی جارێکی عزرائیل هات رۆحی پیاوێك بکێشێ کە تەماشای
ئەندامەکانی لەشی کرد هیچ ئەندامێکی لەش چاکەی نەکردبوو کە
شەویلکی کردەوە دی کە زمانی بە مولاشویەوە نوسابوو ئەی‌ووت
«لا اله الا الله» خوا بە هۆی ئەو ووتە پاکەوە لێی خۆش بوو .

( ئەوە باسی ئەو شتانەیە کە ئینسان پێی کافر ئەبێ )

دیارە موافقی شەرع کافر بوون لە پاش ئیسلامەتی خراپ ترە لەو
کەسە کە کافری ئەصلیە خوا لە قرآن دا ئەفەرموێ : « ان الله لایغفر ان
یشرك به » بە مانای خوا خۆش نابێ لەوکەسەکەکافر بێ « ویغفر ما دون
ذلك لمن یشاء » بە مانای ئەوەی خۆش ئەبێ لە غەیری کفر بۆ کەسێك
آرەزوی بێ وە خوا ئەفەرموێ کەسێك کافر بێ و بە کافری بمرێ خوا
حەرام ئەکا لە سەر ئەوکەسە بەهەشت و جێگای ئەو هەر دۆزەخە .

«ابو الدراء» ئەفەرموێ کە وەصیەتی لە من کردوە پێغمبەر «ص» کە
هیچ کاتێك کافر نەبم ئەگەر پارچە پارچەم کەن یا بم سوتێنن وە هەرگیز

تەرکی نوێژی فەرز نەکەم بە قەستی ، هەرکەسێك بە قەستی تەرکی نوێژ بکا ئەو کەسە ذمەی ئیسلامی نی یە وە فەرموی شەراب مەخۆرەوە چونکە کلیلەی هەموو گوناهێکەوە دووبارە پێغمەر «ص» فەرمووی کەسێك مرتد بوجەزای هەرکوشتنە ئیمامی شافعی ئەفەرموێ کەسێك کافربێ شیری لە ئەستۆی بدەن خوا بمان پارێزێ لە کفر بە لوتفی خۆی ئامین ، وە بزانن ئەی برایان یەکێك لە جۆری کفر ئەوەیە کە ئینسانی بالق عەزمی وابێ کە کافر دەبم بە زویی یا بە درەنگ ئەو هەردوو فکرەدا بە کافر حسابە یا بلێ ئەگەر فلان ئیش بێتە جێ کافر دەبم ئەو کەسە خێرا کافر ئەبێ ، یاکەسێك ئیمان و باوەرری وابێ کە ئەو عالەمە هەر بووە و خوا دروستی نەکردوە یا پێی وابێ کە خوا نەبووە لە پاشا پەیدا بووە یا باوەرری وابێ خوا نی‌یە یا هەیەوعلمی نی‌یە یا باوەرری وابێ کە نوێژێك زیاد لە پێنج نوێژان پێ ویستە ، یا شکی هەبێ کە جوولەکەو ئەرمن کافرن یا لە گەڵ غیرەدین بچێ بۆ کەنیشتە بە شێوەی ئەوان یا انکاری پێغمبەرێك لە پێغەمبەران بکا یا انکاری بکا کە یەکێك لەو پێ ویستیانە «واجباتە» پێویست‌نی‌یە یا پێی وابێ ئەو حەلالە حەرامە یا ئە حەرامە حەلالە یا ئازاری موسڵمانی پێ حەڵاڵ‌بێ یا وەرگرتنی گمرگی پێ حەلال بی یا انکاری زیندبوونە وە بکا یا انکاری دۆزەخ و بەهەشت بکا یا سوکایەتی بە پێغمبەرێك یا مەلائکەێك بکا یا رازی بێ بە کافر بوونی کەسێك یا پێی وابێ وەلی گەورەترە لە پێغمبەران یابێتە کۆسپێك بۆ مسلمان بونی کەسێك یا پێی وابێ کە دروستە پێغمبەرێکی کە بێتە سەر دونیا یا بلێ من حەلاڵ و حەرامم بو نی یە وە پێ ویستی شەرعیم لە سەر نی یە یا بلێ ئەگەر

خواو پێغمبەریش پێم بڵێن ئەو ئیشە ناکەم : یا بڵێ خوا زوڵمم لێ ئەکا ، یا بڵێ شەرع چی یە ، یا بلێ مەحشەر چی‌یە ، یا دۆزەخ ہچـی یە — بە سوکاریەتی ، یا کەسێك بڵێ خۆزگە زینا حەلال بایە یا کەسێکی بێ شەرعی کردوە پێ‌ی بڵێ چاکت کردوە یا بە کەسێك بڵێ ئیمان چی یە ئەویش بڵێ نازانم لەوکاتەدا مەبەستی بێ باکی بێ ، یا کەسێك پێ‌ی وابێ پێغمبەری ئێمە «ص» رەنگی رەش بوە یا عەرەبی نەبووە یا قورەیشی نەبوە ، یا بڵێ نازانم ، ئایا لە مەکە بۆتە پێغمبەر یا لە مەدینە وەفاتی کردوە ، ئەمانە هەمویان کفرن خوا بمان ئاریزێ آمین •

## ئاگادار بن

یەکەم پێ ویستی لە سەر دایك و باوك ئەوەیە کە منالەکانی خۆیان فێر بکەن کە پێغمبەر «ص» لە مەکە لـە دایك بوە وە لـە مەکە بۆتـە پێغمبەر وە لە «مەدینە» وەفاتی کردوە ئێستا مەرقەدی پیرۆزی لە مەدینەیە وە پێ ویستە بزانێ یەکەم شتێك کە پێ ویستە لە سەر ئینسانی بالق چ ژن بێ چ پیاو • اشهد ان لا لە الا اللە واشهد ان محمد رسول اللە ، بێ ، وە مانای بزانێ وە باوەڕێکی بەراستی بە مانای بکا لە پاشان بزانێ کەخوا یەکە وە نیشانەی تەواوی هەن ئەگەر چی دەلیلیش نەزانێ لە پاشان فێری ئەو شتانە بێ کە پێ‌ویستی پێ هەن بۆ بەجێ هێنانی پێ ویستیەکانی دین وەکو ئەرکانی نوێژ و رۆژو مەرجەکانیان وە زانینی مەسەلەی زەکات ئەگەر ماڵی زەکاتی هەبێ و ئەرکانی حەج بزانێ ئەگەر حەجی لە سەربێ لە پاشا ئەو شتانە بزانێ کە زۆر روو ئەدەن وەکو معامەلە بە تایبەتی معامەلەیە کە نزیکە لە سووت وە هەر وەها وەکو پێ ویستیەکانی داد پەروەری

«عدالت» له بەینی ژنان دا وه خزمەتی ئاژەڵ و خۆی بپارێزێ لەو شتەی له دڵی بێ ناخۆش ئەبێ وەگوناه پەیدا ئەکا وەکو رقو کینه حەسودی و خۆ بەگەورەگرتن به سەر خەڵقی دا وه باوەڕی وابێ هەرچی خواو پێغمبەر فەرمویانه راسته خوا موفەقمان بکا آمین •

## ( باسی دەست نویژ )

حەزرەتی «ابو هریره» فەرموی پێغمبەر «ص» فەرموی خوا قبوڵ ناکا نوێژی ئەوکەسەی بێ دەست نوێژ بێ هەتا دەست نوێژ هەڵ نەگرێ ، ابن مسعود فەرموی رابوردم به لای شەخصێکا له قەبردابو لێیان ئەدا سەد دار هەتا وا ئێسك و پێستی نەبێ نەمابوو وه گۆڕی پرر بوو بوو له ئاگر پیاوەکه له گۆڕدا ووتی بۆچی وا ئازارم ئەدەن پێ یان ووت نوێژت کردوه به بێ دەست نوێژ وەرابردووی به لای زۆر لێکراوێك دا ڕزگارت نەکردوه ، بیهقی له سلێمان ئەگێڕیتەوه ئەفەرموێ ئینسان که دەستی کرد به دەست نوێژ هەڵ گرتن گوناهی لێ هەڵ دەوەرێ وەکو پەڵکه گەڵا له پایز دا چۆن له درەخت ئەکەوێته خوارێ • ابو هریره ئەفەرموێ ئەگەر بەندەی موسڵمان چاوی شت بۆ دەست نوێژ هەرگوناهی کیبه چاو کردبێ لا دەچێ ئەگەر باسکی شت هەر گوناهێکی به دەست کردبێ لا دەچێ لەگەڵ ئاوەکه ئەگەر لاقی شت هەر گوناهێکی به لاقی کردبێ لا دەچــی هـــەتا ئاخــری پاك ئەبــێ له گــوناهان وه عبــدالله ی ئیمامی عومەر ئەفەرموێ کەسێك دەست نوێژ له سەر دەست نوێژ بگرێ ده خێری بۆ ئەنوسرێ ئیمامی غــەزالی شەخصێکی مردوی دی له خەودا پێ ی وت

حالت چی‌یه ووتی رۆژێکی نوێژم به بێ دەست نوێژکرد به هۆی ئەوەوە گورگێکم له سەر دانراوه حالم له گەڵ ئەو گورگه زور ناخوشه وه دیاره که کەسێك نەزانێ دەست نوێژ هەڵگرێ بەبێ دەست نوێژ ئەژمێرڕێ ئینشاء الله باسی دەست نوێژ هەڵ گرتن لێره بـه دواوه باسی‌ئەکرێ بەته واوی •

## باسیی پی‌ویستی دەست نویژ

پێ ویسته بۆ دروست بونی دەست نوێژ بیرت وابێ‌کـه ئەو ئـاوه نەگۆرراوه نه به شتی پاك نه بەشتی پیس ئەگـەر بـه شتی پیس بگۆررێ گورانه کەی کەمیش‌بێ خرابه وه ئەبێ ئەوکەسه موسڵمان بێ‌و بزانێ‌که دەست نوێژ پێ ویسته «فرضه» ، وه یەکێـك له فەرزی دەست نوێژ بـه سونەت حالی نەبێ وه نابێ هیچ رێ گرێك «مانع» له سەر لەشی بێ، وه نابێ شتێکی وای به له شەوه بێ که ئاوەکه بگۆرێ و ئەبێ ئاو به سەر ئەندامانی دەست نوێژ دا جاری بێ هەر تەربوون «کفایەت» بەس ناکا ، وه پێ ویسته بۆکەسێك که دەست نوێژی راناوەستێ کاتی نوێژ هاتبێ •

## ( فەررزی دەست نویژ )

فەررزی دەست نوێژ ئەوەیه لەگەڵ شتنی یەکەم بەش له دەموچاو بەدڵ بیری وابێ که «بێ دەست نوێژی له سەر خۆم لا ئەبەم» له پاشا ئاو به دەم‌و چاو دا بکا وه مووو پێستی ئاویان پێ دا بکا له پاشا هەردوو دەستی بشوا له گەڵ ئانیشکیا وه تۆزێکی سەری تەرر بکا وه هەردوو پێی و قاپانی بشوا بەم تەرتیبه نابێ‌پێش‌وپاش هەبێ •

# سونتەتی دەست نوێژ

سونتەتی دەست نوێژ ئەوەیە کە لە یەکەم جارەوە «بسم اللە الرحمن الرحیم» بڵێێ وە لە پاشا لە ئانیشکەوە دەستان بشوا وە لە پاشا سواکی بکا بە هەر شتێکی زوور بێ ، بێجگە لەوکەسەی کە بە رۆژ ووییێ ئەویش لە پاش نویژ پێغمبەر «ص» فەرمویەتی ئەگەر زەحمەت نە بوابە سیواکم پێ ویست «واجب» ئەکرد لە سەر خەڵکی ، وە لە گەڵ هەموو دەست نوێژێك لە پاشان ئاو لە دەم و لوتی وەربدایە سێ لوێچ وە مسحی سەری بکا وە مسحی گوێی بکا وە پەنجە لە ناو مووی ریشی پررا بکێررێ پەنجەی دەست لە ناو پەنجەی پێیدا پێغمبەر «ص» فەرمویەتی جبرائیل هاتە لام پێی ووتم هەر کاتێك دەست نوێژت هەڵگرت مووی ریشت لێك جوێ بکەرەوە وە سونتەتە دەست لێ خستنی ئەندامان ئەگەر معلوم بوو کە ئاوی بە سەردا ناروا دەست لێ خستنی پێ ویستە وە ئەگەر لە دەست نوێژ بووە سونتەتە روو لە قبلەکا وە چاو بەرز کا بۆ ئاسمان وە بڵێ ئەگەر کوێریش بێ « اشهد ان لا اله الا اللّٰه وحده لاشریك لە واشهد ان محمدا عبده ورسوله اللهم اجعلنی من التوابین واجعلنی من المتطهرین سبحانك اللهم وبحمدك اشهد ان لا اله الا انت استغفرك واتوب الیك وصلی الله علی سیدنا محمد وعلی آل محمد » وە سورەتی (انا انزلنا) بخوێنێ لە پاشان ، چونکە پێغمبەر «ص» فەرمویەتی کەسێك بەنچاکی دەست نوێژ بگرێ لە پاشان روو بکاتە ئاسمان وە ئەو دوعایە بخوێنێ هەشت

دەرکی بەهەشتی بۆ ئەکرێتەوە لـە هـەر دەرکێك مەیلی لێی ئـەچێتـە ژوورەوە • پێغمبەر «ص» فەرمویەتی کەسێك جارێك «انا انزلناه بخوێنێ پاش دەست نوێژ لە خوشەویستی خوا حسابەو کەسێك دوو جاری بخوێنێ لە دەفتەری شەهیدان دا ئەنوسرێ وە کەسێك سێ جاری بخوێنی حەشری لە گەڵ پێغمبەر دا ئەکرێ وە سونەتە سێ جار سێ جـار ئەندامەکانی بشۆرێ وە سونەتە (تلفظ) بـە نیی یەت بکـرێ وە وە سەرنجی ئـەو جێگایانە بدرێ کە قوڵیان هەیە وەکو کونە چاو وە ئەگەر ری پۆق هەبوبە چاوەوە پێ ویستە لێی بکرێتەوەو لابـرێ وە ئاو بە هـەر دوو دەست هەڵگرێ وە لە لای سەرەوە ئاو بە چاوان دا بکا وە زیاد لە چاوو لاق و دەستەکان زیاتر بشورێ چونکە پێغمبەر «ص» فەرمویەتی ئومەتی من لە ررۆژی قیامەت بانگ ئەکرێن ناوچاوانیان و لاقیان سپی یە بە هـۆی دەست نوێژەوە کەسێك پێی خۆشە و کـەسێك ئەیەوێ و تاقەتی هەیە با زیاد لە پێویست بیشوا وە پێغمبەر (ص) فەرمویەتی جوان ترین جێگای ئیسان لە رۆژی قیامەت ئەوجێگەیەکە ئاوی دەست نوێژی پێ رادەگـاو سونەتە لای راست وە پێشی لای چەپ بکەوێ وە دەست نوێژ لە سەریەك هەڵگرێ بەینی نەکەوێ بەڵام پێ ویستە کە کاتێك زانیت ئەگەرئەو سونەتانە بەجێ بێنی نوێژت دە چێ ئەبێ هەر پێ ویستی یەکانی دەست نوێژ بەجی بێنی و سونەتەکان تەرك بکەی •

## ( باسی ئەوشتانە کەدەستنویژی پی‌ئەشکی )

یەکێك ئەوەیە کە لێت دیاربێ کە شتێك لە پاش یا لە پێش هاتۆتە دەرەوە هەرچی بێ ، وە یەکێکی کە ئەوەیە کە عەقڵ نەما بە هەرشتێك بێ

بەڵام بە نوستنێکی کە پاشەوە قایم بکرێ وە بای لێ نەیەتە دەرەوە دەست نوێژ ناشکێ وە یەکێکی کەیان ئەوەیەکە هەرچی ئەندامێکی ئادە میزادکە نێرینە بێ و گەورەبکەوێ لە ژنێکی نامەحرەم دەستنوێژی هــەردووکیان ئەشکێ ، وە حەرامە بەبێ دەست نوێژی نوێژ کردن و تواف کردن و سجدە بردن وە دەست دانی شتێك «قورئانی» لێ نوسرابێ وە بێ ویستە لەسەر گەورە نەهێڵێ مناڵ دەست بدات لەوشتە کە قورئانی تیا نوسرازە ، بەڵام مناڵێك کە عــەقلی هــەبێ هــەڵگرتن و دەست لیدانی دروستــە بۆ فێربونی •

## « باسی شتن ـ خوپاکردنەوە »

عبداللەی امام عمر ) فەرمویەتی کە پێغمبەر «ص» فەرمویەتی هەر کاتێك ئینسان جماعی کرد سەری ذەکەری وون بو پێ ویستە خۆشتن ئاوی بێتە وە یا نا (حەزرەتی عایشە) ئەی فەرموو هەر کاتێك پیاو لە خەوخەبەری بووەوە چاوی بەمەنی کەوت خۆی بشوا باوەکو خەویشی نەدی بێ ، بەلام ئەگەر خەوی دی بو کە هەڵسا هیچمەنی چاو پێ نەکەوت خۆشتن پێ ویست ناکا • وە هەر وەها ژنیش وەکو پیاو حساب ئەکرێ •

عبداللەی امام عباس ئەفەرموێ ملائکەت حازر نابێ بۆ لای ئینسانی لەش پیس هەتا خــۆی پاك نەکاتەوە ، وە ابو داود ز نسەنی ئەفــەرموون ملائکەت ناچن بۆ ژوورێك کە وێنە تەواوی تێدابێ یا سەگێك یا لەش پیسی تێدا بێ حەزرەتی علی «ر» ئەفەرموێ کەسێك جێگای موویەك نەشوا ئازاری دۆزەخی تووش ئەبێ وە ئەفەرموێ من سەری خۆم بە تەزازی ئەتاشم •

ابو هریره ئەفەرموێ لە ژێــر هــەموو موویــەك پیسی هەیە مووەکە هەربشۆن وە حەرامە بۆ پیاوی لەش پیس و ژنی خــاوەن « حیض » لە مزگەوت دا بێ ابو هریرە ئەفەرموێ کە سێك « جماع » لە گەڵ ژنی خاوەن حیض بکا یا تصرفی پاشەوەی ژنی خــۆ بکا یا بچێتــە لای ئەوکەسانە کە خەبەرە غەیب ئەگێڕنەوە ئەوانە هەموو گوناهێکی زۆرگەورەن •

حەزرەتی عایشە ئەفەرموێ هەر وەختێــك پێغمبەر « ص » لەش پیس بوایە وە رێی خۆشتن و پاکردنەوەی لەشی نەبوایە دەست نوێژی هەڵ ئەگرت و ئینجا نانی ئەخوارد یا ئەنوست •

(عبداللە امام عباس) ئەفەرموێ خوا رێگەی ئێوە ئەگرێ لە خۆشتن بە رووتی لە بەرچاوی خەڵکی ، وە پیویستە ئینسان خۆی لە بەر چاوی خەڵك ون کا بە هەر جۆرێك بێت پێغمبەر «ص» جارێك پیاوێکی بــە کرێ گرت بووکە تەماشای کرد پیاوەکە خۆی پاك ناکاتەوەو خۆی ناشوا بەبێ پاکی پێغمبەر «ص» فەرموی ئەتۆ شەرم لە خوا ناکــەی ؟؟ بــردۆ پارەکەت کە کرێی خۆتە هەڵی بگرە وە من بێ ویستیم بە تۆ نی یە•

ئیمام ی غەزالی ئەفەرموێ چاویان بە پیاوێك کەوت لێیــان پرسی خوا چی لە گەڵ کردی ووتی ئیم گەرریو رۆژێك رێم نەبوو کە خۆم پــاك کــەمەوە خوا لەبەر منی کــرد بەرگێکی ئاوریــن تێ ی دا هــەڵ دەسووڕێنم •

## « ئەوشتەی کە خوپاکردنەوە پیویست ئەکا »

یەکێك لەوانە ئەوەیە ئینسان مەنی لێ بێتە دەریا سەری زەکەری بچێتە فەرج ، یەکێك پەیدابونی « حیض » یەکێکی کە خوێنی پاش منالْ وە یەکێکی کە منالْ بون با هیچ خوێنیش نەبینێ وە یەکێك کە ئینسان مرد پێویستە بشۆرێ • وە شەرتی خۆ پاکردنە وە ئەوەیە ئاوێکی پاك بێ وە بە لەش نەگۆررێ ، فەرزو بێ ویستی یەکانی خۆ پاکردنەوە ئەوەیە کە نی یەت بێنی کە «لەش پیسی لە سەرخۆم لائەبەم » وە تەواوی رووی لەشی و مووی لەشی ئاویان بە سەردا بکرێ هەتا ئەوکەسەش کە خەتەنە نەکراوە ئەبێ ئاوی وە بنەوە بکەوێ •

## « سوننەتی خوپاکردنەوە »

ئەوەیە لە یەکەم جارەوە «بسم الله» بکەیت وە ئەو جێگایانەی کە پیس‌و ناشیرینن بیان‌شوا وە دەست نوێژهەڵ گرێ وە ئەو جێگایانەی کە چاڵن بیان شوا وە دەست بە لە شیی خۆی دا بێنێ وە روو بکاتە قبلەو دوعای دەست نوێژ لە پاش لێ بوونەوە بخوێنێ وەك دەست نوێژ ئەکەس یارمەتی نەدا وە سێ جار بووترێ وە لە سەر یەك بێ •

## « باسی گەورەیی نویژ »

خوای تەبارەك‌و تعالی ئەفەرموێ «.ان الصلاة كانت على المؤمنين كتابا موقوتا » ئەو پێنج فەرزە نوێژانە بێ و... لە ......

موسلمانێك كە لە وەختی خۆی دا بیکا وە گوناهە كە دوا بخرێ وە خوای گەورە ئەفەرموێ «یا ایها الذین آمنوا لاتلهكم اموالكم ولا اولادكم عن ذكر الله » مانای : ئەی موسلمانینە بە هۆی ماڵ و مناڵ نوێژتان لە بیر نەچێتەوە وە غافڵی نەكەن وە نەی خەنە پشت گوێ ، « ومن یفعل ذلك فاولئك هم الخاسرون » مانای ئەوكەسەی كە پێ باکی بكا لە نوێژدا هەر ئەوە خەسارەت مەندە لە رۆژی قیامەت « عبداللەی ابن عمر » ئەفەرموێ پێغمبەر «ص» فەرمووی یەكەم شتێك كە پێ ویست كراوە لە سەرمیللەتی من ئەو پێنج فەرزە نوێژانەن وە یەكەم شت كە بەرز ئەبێ تەوە ئەو پێنج فەرزە نوێژانەن وە یەكەم شتێك پرسیاری لێ ئەكرێ لە رۆژی قیامەت ئەو پێنج فەرزە نوێژانەن ، كەسێك نوێژێكی بەرنەكەوتبێ و نەیزانیبێ ، خوای گەورە ئەفەرموێ تەماشای نوێژی عەبدی من بكەن هیچ نوێژی سونەتی هەن تەواوی نوێژی فەرزی پێ تەواو بكرێ ، وە تەماشای رۆژی رەمەزانی عەبدی من بكەن ئەگەر بە فیررۆ «ضایع» ی دابێ سەرنجی لێ بدەن هیچ رۆژووی سونەتی گرتون نانەواوی رۆژی فەرزی پێ تەواو بكرێ ، وە ئەفەرموێ تەماشای زەكاتی عەبدی من بكەن ئەگەر نانەواوی بوو ، وە ئەفەرموێ تەماشای بكەن بزانن ایا چكەی زیادی هەیە نانەواوی فەرزی زەكاتی پێ تەواو بكرێ ، ئینجا ئەو وەختە بە سونەتەكان فەرزی پێ تەواو ئەكرێ بە لوتفی خوا جا ئەگەر زیادی مایەوە بۆی دائەررژێتە تەرازوی وە پێی ئەڵێن بررۆ بۆ بەهەشت بە دڵشادی و كەیف خۆشی ، وە ئەگەرهیچ نەمابوو فەرزی پێ تەواو بكرێ وە خوا لێی نەبورد ئەوا

ئەمر ئەکرێ بە مأموری دۆزەخ دەست و پێی ئەگرێ وە لە دوزەخی ئەنێ •

(جابر) ئەفەرموێ چۆنی یەتی ئەو نوێژانە وەکو چەمێکی‌جاری وایە کە لە بەر دەرکی دا حزربێ وەرۆژی پێنج جار خۆتی لێ بشۆی مانای هیچ گوناه ناهێڵن • (عبداللّه امام عمر) ئەفەرموێ هەر زەمانێك عەبد نوێژی‌کرد گوناهەکانی هەمو لە سەر سەرووشان دائەنرێ هەر وەختێك سوجدەی برد یا رکوع گوناهەکان هەموو مەحو ئەبنەوە (ئیمامی عثمان) ئەفەرموێ هەرموسڵمانێك ئامادەبو بۆ نوێژی فەرز بە تەواوی بەو مەرجەی دەست نوێژ باش هەڵگرێ وە ئەرکانی نوێژ باش بەجی بێنیو لە نوێژدا لە خوا بترسێ ئەو نوێژە ئەبێتە مەحووکردنەوەی هەر گوناهێکی لە پێشەوە کردبێتی‌بیجگە لە گوناهی گەورە شێخ ابن‌حجر ئەفەرموێ لە حەدیثدا کەمێك ئاگاداری ئەو پێنج فەرزانە بکا خوا گەورەی ئەکات بە پێنج خاصیەت یەکەم ژیانی ناخۆش نابێ وە ئازاردانی گۆرری نابێ وە سێهەم خوا نامەی ئیشەکانی بە دەستی راستدا بۆی دێنێتە حوارێ وە لە سەر پردی سیرات «صراط» وەك بروسکە خۆی ئەکا بە ناو بەهەشتدا بەبێ حساب • وەکەسێك بێ باکی بکا لە نوێژ خوا نارەحەتی ئەکا بە پانزە خاصیەت یەکێکێن ئەوەیە بەرەکەتی لە عومر دا نابێ وە رووی چاکە لە نێو چاوانیا دیار نابێت ، وە هەرکارێك بیکات خێری نی‌یە ، وە دوعای ناچێ بۆ ئاسمان وە کەڵکی نابێ لە دوعای پیاوچاك وە ئەمرێ بە زەلیلی و ئەمرێ بە تینوێتی و برسێتی ، ئەگەر هەموو ئاوی دەریا بخوا تینۆ تی ناشکێ وە گۆرری لە سەر تەنگ ئەبێ هەتا پەراسوی تێك

دەبەررن وە گۆرری بۆ پرر ئەبێ لە ئاگر شەوو رۆژ خوا مارێکی بۆ سەر ئەنێرێ کە ناوی (شجاع الاقرعە) چاوی لە ئاگرو لێوی لە ئاسن وە هەر نینۆکێکی رێگای رۆژێکە قسە لەگەڵ مردوو ئەکاو ئەڵێ من (شجاع الاقرعم) دەنگی وەك دەنگی هەور وایە ئەڵێ خـوا ئەمری پـە من کردوە بە تۆوە بدەم لە سەر گوێ پێ نەدانی نوێژی بەیانی هـەتا تۆ ئەکەوێ وە پێت وە بـدەم لە سەر فەوتاندنی نوێژی نیوەررۆ تاکـو نوێژی (عصر) ئێوارە وە پێت وە بدەم لە سەر فەوتانی مغرب تاکو نوێژی خەو تنان (عشا) وە لە سەر فەوتانی نوێژی (عشاء) تاکو نوێژی بەیانی وە هەر کاتێك کە پێ وەی ئەدا هەفتا گەز بە زەوی دا ئەچێتە خـوارێ ئەمە ئازارو روتانی یەتی هەتا خوای گەورە لوتف ئەکا ، وە لە رۆژی قیامەت حسابی بەتوندی ئەکرێ وە خوا رقی لێیەتی و ئەچێتە دۆزەخ وە ریوایەتێك هەیە لە سەر دەم و چاوی ئەنوسرێ ئەی ئەو کەسەی بە ضایعت داوە هەقی خوا ئەی ئەوکەسەی خوا رقی لێتەوخوا بە ضایعت دا هەروەکو بە ضایعت دا هەقی خـوا ئەم ررۆ بێ بەشی لـە رەحمەتی خوا ، پێغمبەر «ص» ئەفەرموێ بنچینەی ئیسلامەتی سێ شتن یەکیان شەهادەت ووتنە و دووە میان نوێژ کردنە سێیەمیان رۆژوگرتنە .

«ئیمامی شافعی» ئەفەرموێ کەسێك نوێـژ نەکا بە فاسق دائەنرێ وەتر تا ئەکوژرێ سە ئەمری گەورەی ئیسـلام و زانایانی تر ئەفەرموون کافر ئەبێ ئەگەر لە خوا نەترسێ .

# باسی دواخستنی نویژ

خوا ئەفەرموێ «ویل للمصلین الذین هم عن صلاتهم ساهون» پێغمبەر «ص» لە مانای ئەم آیەتە ئەفەرموێ خوا زەمی ئەوکەسانە ئەکا کە نوێژ دوا ئەخەن لە وەختی خۆی بە مانای ئازاری توندو قایم هەیە بۆ ئەو کەسانە کە نوێژ دوا ئەخەن لە کاتی خۆی وە هەندێك لە مانای ئایەتەکە ئەڵێن وەیل هەیە بۆ ئەوکەسانە • وەیل بریتی‌یە لە جێگایەك لە دۆزەخ دا کە هەموو کێوی دونیای تێ بخەی ئەو کیوانە ئەتوێنەوە لە بەر توندی و گەرمایی ئەو شوێنە شوێنی ئەو کەسانەیە •

(عبداللە ئیمام عباس) ئەفەرموێ پێغمبەر «ص» فەرمویەتی کە سێ کەس هەن خوای تەبارەك وە تعالا کاروفرمانیان لێ قبوڵ ناکا ، یەکێکیان ئەوەیە جماعەت ئەکا بۆ قەومێك پێ یان ناخۆشە وە یەکێك ئەوەیە کە نوێژ پاش چوونی ئەکا وە ئەوی کەیان ئەوەیە کە ئینسان ئەکا بە بەندەی خۆی وە ئەی فرۆشی وەکو ئینسان ژن بفرۆشێ و پارەی لێ وەربگرێ کە پێ‌ی ئەڵێن شیربەها وە هیچ نکاحت بە سەر ئەو ژنەوە نەبێ پێغەمبەر «ص» فەرمویەتی ئەگەر عەبد نوێژی کرد لە یەکەم کاتێکا ئەو نوێژە بڵند ئەبێتەوە بۆ ئاسمان وە خاوەنی نورە هەتا ئەگاتە عەرش ئەو نوێژە داوای لێ خۆش بوون ئەکا بۆ خاوەنی هەتا رۆژی قیامەت و بە خاوەنەکەی ئەڵێ خوا ئاگاداریت بکا وەکو ئاگاداری منت کرد و ئەگەر نوێژی لە وەختی خۆی دا نەکرد ئەو نوێژە بۆ ئاسمان ئەچی وتاریکی لە سەرە ئەگەر گەیشتە ئاسمان ئەپێچرێتەوە وەکو پەررو بە دەمی خاوەنەکەی دا ئەدرێتەوە •

« ئیمامی عومەر » ئەفەرموێ گەورەیی یەکەم کات لە سەر آخـر کات وەك گەورەیی قیامەت وایە بـە سەر دونیادا ، گرنگ‌و پیرۆزترین کاری ئینسان لە خزمەت خوادا خێرایی کردنە بۆ نوێژ لە یەکەم کاتی دا.

ئاگادارکردنەوە دوا خستنی نوێژ لە کات‌و وەختی خۆی دا لەگـەورەترین گـوناهە کـە بەبێ عذربێ پێ ویست «واجب» . لـە سەرئەوکەسەی کە نوێژی فەوتاند کە قـەزا « قضاء » بی‌گێرێتەوە بـە خێرایی وە هیچ‌کارێکی کە نەکات مەگەر ئەوەندە کە بۆ مەسرەفی ماڵ و منالی بە خێو کردنیانی « نفقه » . بێ ویستە ، هەروەك نوێژ دواخستن گوناهە دیسان أێش خستنیشی لە کاتی خۆی هەر گوناهە وە نوێژ واجب ئەکرێ لە یەکەم کات‌دا بەڵام دروستە لە ڕوەراستی وەخت دا بکرێ وە گوناهی نی یە بەومەرجەی کە لە پێشەوە نیازت وابێ کە لە ناوە راستی کات دا یا لە دوای کات دا ئەیکەی ، وە ئەگینا گوناهـە دواخستنی لـە یەکەم کاتی ، وەکو گوناهە کە نوێـژ بوو بنـویت وە کەسیش نەبـو خەبەرت بکاتەوە ، وە هەروەها سوننەتە دوا خستنی نوێژلـە هـەوەڵی کاندا کە زانیت لە دزایی جەماعەتت دەست ئەکەوێ هەتا وەختێك مەـ‌ـالت ئەبێ بەڵام ئەگەر هەر بە شك بوو دواخستنی دروست نی‌یە .

## « باسی مەرجەکانی نوێژ »

پێویستە ئەو کەسەی نوێژئەکاگەر پیاو بێ یا ژنی جاریی‌یە ما بەینی ناوکوو ئەژنۆی بە دەرەوە نەبێ وە ئەگەر ژنی « حرة » بێ بێجگە لە دەم و چاو‌و دەستی نابێت هیچ شوێنێکی بـە دەرەوە بێت وە ئەبێ بـە

بەرگێك بێ کە ڕەنگی لەشی لێ دەرنەکەوێت ، وە ئەگەر توانای بەرگی نەبوو ئەبێ قوڕێکی پاك بە سەرلەشیی دا بسوێ وە لەشیی پێ دابۆشێ ، وە پێ ویستە لە نوێژدا ڕووەو قیبلە نوێژ بکرێ مەگەر نوێژێك کە لە شدەتی ترسدا ئەکرێ وەیا سوننەتی سەفەرێ ، وە پێ ویستە بە بیری خۆت وابێ کە نوێژ بوەو پێ‌ویستە کە چۆنیەتی نوێژ بزانێ بەو مانایە ئەوشتەی کە فەرزە لە نوێژدا جیای بکەیتە وە لەو شتەی کە سوننەتە ، بەلام ئەگەر مەبەستت بە فەرزێك سوننەت نەبێ باشە وە ئەبێ بەرگ و لەش وە شوێنی نوێژ پاك بێ لەو شتانەی کـە عەفویان لێ نەدراوە •

## « فەرزی نوێـژ »

فەرزی نوێژ ئەوەیە کە پێ ویستە لە کاتی دابەستنی نوێژ نی یەتت وابێ کە ئەوە نوێژەی کە خاوەنی وەخت بێ بە دڵ دیاری بکەی وەکو نوێژی بەیانیان یا نیوەڕۆ وە بیرت وابێ کە ئەوە فەرزە وە ئەبێ بڵێی نیی یەتم هەیە ئەکەم نوێژی فەرزی نیوەڕۆ وەلازمە نیی نی‌یەتی ئەو شتانە لەگەڵ « الله اکبر » لە دڵت دابێ وە لـە کاتی دابەستنی لفظی الله اکبر بڵێی بەم جۆرە کە بۆخۆت گوێت لێ بێت ، وە هەر شتێك لە واجباتی نوێژدا ئەووترێ پێویستە بۆ خۆی گوێ‌ی لێ‌بێت بەو تەرتیبی ێشە وە ، وە کەسێـك تاقەتی ڕراوەستانی هـەبوو ئەبێت ڕراوەستێ و ئەگەر نەتوانێ بەم مانایە بە پێوە هـۆشی نوێژی کـەم ئەبو ئەبێ بـە دانیشتویی نوێژ بکا ئەگەر نەی توانی دانیشێ ئەبێ بە ڕاکشانەوە نوێژ بکا هەتا ئینسان عەقلی هەبێ ئەبێت هـەر نوێژ بکا وە پێ ویستە کـە

سورەتی «فاتحە» لە گەڵ «بسم اللە الرحمن الرحیم» بخوێنێ. مەگەر کەمێك امام لێی پێش کەوت بێ ئەگەر لە رکوع دا بە ئیمام دا رابگا ئەو رکاعەتەی بۆ حساب ئەکرێ وە ئەبێ ئاگاداری بیت و سەرو بۆرو راستی « فاتحە » بکرێ وە بەین نەخانە کلمەی « فاتحە » وە ووتەکانی « تحیات » هەروەکو « فاتحە » ئاگاداری بکرێ ئەگەر لە نێو فاتحە لفظێکی کەی ووت مەبەستی واز لێ هێنانی فاتحە بوو پێویستە کە دیسان لە سەرە وە بیخوێنیتەوە ، وە ئەگەر مەرام و مەبەستی وە بیرهێنانەوەی ئیمام بوو زەرەری نی‌یە ، ئەگەر کەوتە شك ئا یا پیتێك یا ووتەیەکی « فاتحە » ی بە جێی هێشتوە پێش تەواوکردنی «فاتحە» پێ ویستە لە سەرەوە بی خوێنیتەوە وە ئەگەر لە دوای فاتحەوە بوو ئەوا تأثیری نی‌یە ، وە یەکێك لە واجباتی نوێژ ئەوەیە کە « رکوع » بەرێ بە جۆرێکی وا کە بەری دەستی بەرامبەری ئەژنۆ بوەستی لە پاشان لە پێش رکوعدا لە یەکەم جارەوە چۆن بوو ئاوا بڵند ئەبێتەوە وە سوجدە بەرێ دوو جار ، هێندێك لە ناو چاوان وە جێ سوجدە بکەوێ ، ئەو شتەی کە سجدەی لە سەر ئەبێ نابێ بجوڵێ بە جوڵانەوەی ئەو کەسە وە ئەبێ هەردوو ئەژنۆ دانرێ وە هەردوو بەری دەست دانرێ لە گەڵ قامکی پێیان وە پێ ویستە گرانی سەربکاتە جێی سجدە وە لای بەرەوە بڵند بێتە وە بە سەر لای سەری داو کەمێك لە بەینی دوو سجدەدا دانیشێ بەڵام درێژ نەبێتەوە وە قەرار بگرێ وە لە هەڵسانەوە لە ( رکوع ) قەرارگرتن پێ ویستە وە ئەبێ مەبەست لەو سجدەو رکوعە فەرزی نوێژبێ ، وە پێ ویستە لە نوێژ دا «تەحیاتی» آخری هەتا «اللهم صل علی محمد» تەواو ئەبێ •

# «سوننەتی نویژ»

لە وەختی دابەستنی نویژدا ئەبێ بلێی ئەم نویژە ئەکەم بۆ خوا وە ررووم لە قیبلەیە وە ئەوەندە رکاعەتە یا بە « أدا » یا بە « قضاء » وتلفظ بکەی بەو شتەی کە لە دلت دایە وە تە ماشای شوێنی ئەو سجدەیە بکەی وە سەری خۆتی بۆ کەچ و نەوی بکەی وە لە پاشان دەست بلند بکەیتەوە بە رامبەر بە شان لە گەل « الله اکبر » دا دای بەستن وە لەگەل رکوعو لە گەل هەلسانەوە لە رکوعو لە تحیاتی یەکەم دەستی راست لە سەر دەستی چەپ دانێ و هەردو قاچ ئەبێ بستێك لە یەك دوورین دوعای کردنەوەی بخوێنێ : کە « وجهت وجهی یە یە » تا آخری ، لە پاشان « أعوذ بالله » بخوێنێ لە هەموو رکعاتێکدا لە سەرخۆ ئەگەر «فاتحه» تەواو بوو بلێ «آمین» یا ئەگەر گوێی لە آمینی ئیمام بوو بلێ «امین» چونکە پێغمبەر «ص» ئەفەرموێ ئەگەر ئیمام ووتی آمین و ئینسان ووتی ملائکەتیش ئەلێن امین ئەو وەختە خوا ئەم دوعایە گیرا ئەکا وە لە پاش تەواو بونی «فاتحه» لە دوو رەکعاتی یەکەم جار دا کەسێك ئەگەر بزانێ ئایەتێك یا سێ ئایەت بخوێنێ یا سوورەتێك ، بەلام کەسێك گوێی لە ئایەتی امام بۆ خۆی ئایەت لە دوای فاتحه نەخوێنێو تێ فکرێ لە مانای قورئان و ئەو ذکرەی کە ئەیخوێنێ « والله اکبر » بلێ لەگەل هەموو بلند بوونەوەو دانەوین دا لەغیری هەستانەوە لە رکوع « الله اکبر » درێژ بکاتەوە هەتا ئەگاتە ئەورکنەی بۆی ئەچی و بەری هەردوو دەستی لە سەر ئەژنۆ دابنێ وە ئەستۆو پشتی رێك سێ لە رکوع دا وە لە وەختی تحیات خوێندن

تەماشای پەنجەی شهادە بکا لە وەختی [ الا الله ] پەنجەی شهادە کەمێك بلند بێ هەتا هەڵ ئەسێتەوە یا سەلام ئەداتەوە وە لە کاتی لێ بووندوەی نوێژ ئاوڕ بە لای راست و چەپ دا بداتەوە وە نی یەتی وابێ کەوا لە نوێژ بووەوەو وە سوننەتە کە مەبەستی بە سەلام دانەوەی نوێـژ سەلام کردن بێ لە سەر ئەو کەسانە کـە لـە تەرەفی حازرن یا ئینسان یـا ملائکەت •

## « بعضی نویژ »

بعضی نوێژ ئەوەیە یەکێك تحیات خوێندنی یەکەمە لەگەڵ صلواة ووتن لە سەر محمد لە پاش ئەو مانای بلێ و علی محمد وە لە گـەڵ صلوت دان لە سەر آل لـە دوا تحیاتی دوایی مانای بلێ « وعلی ال محمد » وە قنوت بخوێنێ لە پاش رکوعی آخر لە نوێژی سبحەینێ وە لە پاش رکوع ئەوترێ لە نیوەی ئاخری رەمەزان ، ئەگەر یەکێکی لە وانە تەرك کرد سوننەتە لە پێش سلام دانەوەدا دوو سجدە بەرێ وە لەو سوننەتانەن کە لە پێش نوێژ ئەکرێن ، بانگ ووتن و قامت کردن بۆ پیاو ئەگەرچی گوێشی لە بانگ بـێ • بەلاّم بـۆ ژن هـەرقامەت سوننەتە ئەگەر بۆخۆی بانگ بە وونی بلێ باشە وە لەسوننەتی گەورەیەکە هەڵسای بۆنوێژ کردن سواك بکەی ، پێغمبەر «ص» ئەفەرموێ ئەگـەر لە بەر گـرانی و زەحمەت نەبوایە واجبم ئەکرد لـە گـەڵ هەموو نوێژێکدا سواك کردو ، نوێژێك بە سواك کردن گەورەترە لـە نوێژێکی بەبێ سواك بە حەفتا پلە ، وە سوننەتە کە ئینسان نوێژی کرد رو و بکانە دیوارێك یا هەر شتێك بێ ئەو وەختە بۆی دروستە کە مانع بێ

ئەس بە پێش دا رانەبورێ وە ئەگەر شتێکیش رابورد ئەوا نوێژی نابرڕێ •

## «مکروهانی نویژ ئەمانەیە بەلام نویژ بە تاڵ ناکا»

یەکێك لە وانە ئەوەیە کە دەستت داپۆشرابێ لـە وەختی دابەستنی نوێژدا وە لە وەختی سجدە بردنا یا قاچان پێکەوە بنوسێنێ ، یا لە سەر قاچێك رراوەستێ یا نوێـژ بە بەرزی بخوێنێ لەکاتی سـەر خۆیی یا بە چەپەوە بە «عەکسەوە» یا سەر زۆر دانەوێنێ • لە رکوع دا یـا باسکان لە سەر زەوی دانێ لە وەختی سجـدەدا چـونکە سوننەتە هەر دەسـت دانێ و باسکان بەرز بکەیتەوە وە هەروەها مکرو هەگەرلوت دانەنێ یا «اعوذ بالله» یا «الله اکبر» نەڵێ یا [أقلی] تسبیحات ی سجدەو رکـوع نەڵێ یا تف فرێ بدا بۆپێشە وە یا بۆ لای راست یا اشارەتی وا بکەی لە مەبەسێك حاڵی بکەی یا دەست لە کەلەکە بنێ ی •

« ئەمە سوورێکە » « فائدة » حەرامە ئاوورر دانەوە لە نوێژ دا وە چاو بڵند کردن بۆ ئاسمان بەڵکـو ئەبێت تەماشای جێی سجـدە بکـەی پێغمبەر «ص» فەرمویەتی کە سێك لە نوێژدا چاو بەرز بکا خوا ئەو نوێژە گیرا ناکا ، مانای خێری تەواوی نی یە وە هـەروەها فەرمویەتی چی‌یە وەضعی ئەو عالەمەی کە چاوی خۆیان بۆ ئاسمان بەرز ئەکەنەوە یا واز لەو کارە بێنن یا چاویان دێتە دەرەوە وەحەرامە نوێژ کردنی سوننەت لە وەختێ نوێژی نیوەررۆ نەبووە و کەمێ ماوە بێجگە لە رۆژی هەینی نەبێ ، هەروەها لە پاشە نوێژی سبحەینێ و عەسرهەتا رۆژ بڵند ئەبێ یا ئاوا

ئابێ مەگەر لە بەرسەبەبێك بێ وەكو نوێژی دەست نوێژ یا «تحیة‌المسجد» یا نوێژی قەزا بەلام بە ئارەزووو نەی خاتە ئەو وەختانە وە مكروهـە نوێژكردن ئەگەر دەست نوێژت گـران بێ یا لەلای خـواردنێك بیـت ئارەزوت لێ بێت وە هەروەها نوێژكردن لە گۆررستان و لە سەر رێگای گشتی خەلك دا •

## «ئەو شتانەی كە نویژ بە تال ئەكەن»

ئەوەیە كە تلفظ بكەی بە دوو پیت «حرف» لە سەر یەك باوەكو لەكۆخەش دابێ یا یەك پیت بێو مانای هەبێ لە ووتەی انسانا نەك قورئان بێ ، بەلام قسەی كەم كە ئاگات لێی نەبێ یا نەزانی كە لە نوێژدای یا نەزانی كە حەرامە ، بەلام تازە موسلمان بوو یا دوور لەوكەسە ئەومەسەلەیە بزانێ ئەوە نوێژی پێ‌بەتال نابێ وە هەروەها بە تال نابێ بە پێ كەنین‌و كۆكین‌و بژمین ئەگەر بە هەوەس خویان نەبێ و زۆر نەخایەنن بە قەدەر ركعاتێك ، وە یەكێك لە وانەی نوێژ بە تال ئەكا ئەوەیە كە بە قوەت بجولێت وەكو بازدان یا جولاندنێكی زۆر بكەی لە غیری جنسی نوێژ وەكو سێ جار دەست بجولێنی بەلام بەمەرجێـك بەتالی ئەكـا ئەوجولاندنەوانەلە سەریەك بن وە بەینیان‌نەبێ ، بەلام جولاندنەوەی قامك زەرەری نی‌یە وە یەكێكی كـە لەوانەكە نوێژی پێ بە تال ئەبێتەوە ئەوەیە كە یەكێك لە ئەركانی نوێژ تكرار بكرێ بە ئەنقەست و یا درێژكردنی روكنێكی كورت وەكو هەلسانەوە لە ركـوع یا دانیشتن لە بەینی سجدە بزۆردرێژبكەی بە ئەنقەست یا زەرەر

بەشەرتێك لە شەرتەکانی نوێژ بـدەی یا واز لێ هێنانی روکنێـك لـە ئەرکانی نوێژ •

## « گوی دان بە نویژ »

پێغمبەر «ص» فەرمویەتی کە جارێکیان چاوی کەوتوە بـە یەکێـك نوێژی ئەکرد وە سجدەو رکوعی تەواو نەئەکرد فەرموی ئەگەر ئـەو یەکە لە سەر ئەو وەضعە بمرێ بە ئومەتی من حساب ناکرێ وە هـەر وەها پێغمبەر «ص» فەرموی وەضعی ئەو کەسە کە نوێژ ئەکاو سجـدەو رکوع تەوا و ناکا وەکو کەسێکی برسیی وەهایە کەشتێك ئەخوا و برسیتی بە هیچ جۆرێك تەواونابێ واتە تێر نابێ بە مانای ئەو نوێژە کەڵکی پێ نادا وە خوا تە ماشای بە مەرحەمەتی نی یە بۆ کەسێك بێ مبالاتی بکا لە نوێژ کردن پێ ویستە بۆ ئەوەی کە خێری نوێژت بۆ بنوسرێ لە نوێژدا لە خوا بترسەیت وابێ ئەوە لە خزمەت خوادا وەستاوی و مێی ئەکرێ کە غەزەبت لێ بگرێ وە رەحمەتت بە سەردا بنێری وە ئەدەبێکی زۆربکەی • پێغمبـەر «ص» فەرمویەتی لە نوێژدا بـیری مردن بکەنەوە چونکە باعثی یادکردنەوەی خوایە هەتاوەکو هێندێك لە عالمەکان ئەفەرمون کەسێك نوێژ بە بێ ترسی خوا بکا ئەو نوێژە بە تاڵە وە سوننەتە لە پاش نوێژ دوعاکردن بۆ دین و دونیا هەرچۆنێك ئەی زانی وە زۆر دوعـابکە چونکە خوا دوعاکردنی عەبدی پێ خۆشە وە زۆر مەبەستە کەسێك بتوانێ پاش نوستن هەڵسێ نوێژ بکا بە تایبەتی لە نزیك رۆژبوونەوە چونکە ئەو وەختە وەختی دوعا گیرا بوونە هەتا نوێژی شەو واجب بووە لە سەر پێغمبەر

«ص» وه خوا مەدحی ئەو کەسانە ئەکا کە لەووەختە دوعـا ئەفەرموێ «وبالاسحار هم یستغفرون» مانای لە نزیکی رۆژ داوای لێ خۆش بوون ئەکەن ، یارەبی خوایە خۆش بی لە گوناهمان بۆ خاتری خۆشەویستی خۆت کە «محمد المصطفی» یە «صلی اللە علیه وسلم» •

## « باسی نوێژی جماعەت »

پێغمبەر «ص» فەرمویە نوێژێك بە جماعەت خێرترە لە نوێژی تەنیایی بە بیست و پێنج پلە چونکە هەروەختێك یەکێك لە ئێوە دەست نوێژی بە چاکی هەڵگرت لە پاشان هات بۆ مزگەوت مەبەستی بۆ جماعەت بێ نەك بۆ ئیشی دونیایی بە هـەر شەقاوێکی دەخێری بۆئـەنو سـرێوە دەگوناهی لێ مەحو ئەبێتەوە وە هـەرکاتێك هاتە مزگـەوت وەکو لـە نوێژدا بێ وایە مەلائکەت دوعای بۆ ئەکەن مادام عالەم ئازار نـەدات یا بێ دەست نوێژ نەبێت • وە پێغمبەر «ص» فەرمویەتی ئەگەرئینسان نوێژ بە جماعەت بکا لانەچێ هەتا ئیمام لادەچێ خێری نوێژی شەوێکی تەواوی بو ئەنوسری وە فەرمویەکەسێك بۆ نوێـژی جماعـەت برروا بە پێ بۆ نوێژی فـەرز خێری حەجێکی هـەیە کەسێك بۆ نوێژی سوننەت بچـی بۆجەماعەتکردن خێری عومرەیەکی سوننەتی هەیە وە فەرمویەکەسێك چل رۆژ لە گەڵ دابەستنی نوێژی ئیمام حازربێ وە خێرا نوێژ دابەستێ بـە جەماعەت خـوا دو بەرائـەتی بۆ ئەنـوسێ یەکێـك بـەری بـون لە ئاگـری دۆزەخ دووەم بـــەری بـوون لـــە منافقـی فەرمویەگەورەتر نیە لە جماعەتی بەرە بەیان یانی رۆژی هەینی ئیتر وایە هەرکەسێك حازری ئەو جماعەتەی بەیانی یە ببێ خوا لـێی خـۆش

نەبێ وە فەرمویەتی بەیانیان و خەوتنان [ عشا ] لە هەموو نوێژێك گران
رە ، لە سەر منافقان ، ئەگەر بیان زانیایە خێری چی‌یە لە سەر
ئەژنوو ئەهاتن بۆ جماعەت ئەو دوو نوێژانە لە سەر ئێوە بێ ویستە
راوەستان لە ریزی پێشە وە چونکە ریزی پێشەوە وەك ریزی ملائکەتانە •
وە پێغمبەر «ص» فەرمویەتی بیرم وایە کە کەسێك بکەم بە ئیمام بۆ
خۆم لەگەڵ جماعەتێك بڕۆم بۆ لای ماڵی ئەو کەسانەی کە ئۆوێ یان لە
بانگە وە حازر نابن بۆ جماعەت داری زۆر کۆبکەنەوە ماڵی ئەو کەسانە
ئاگر بدەم کەسێك گوێی لە دەنگی بانگ بێت و حازر نەبێت بۆ جماعەت
خێر لە نوێژەکەیدا نی‌یە ، پرسیار لە «عبداللە ی ئیمام عباس» کرا کەسێك
شەو بە خەبەربێ وە هەموو رۆژ بە رۆژوو بێ بەڵام حازری جماعەت نەبێ
ئەو کەسە چۆنە ؟ فەرمووی ئەگەر ئەو کەسە لە سەر ئەو
حاڵەتە بمرێ ئەچێتە دۆزەخ •

وە بزانن کە ئەصلی جماعەت لە نوێژی فەرزدا فەرزی کفایەتەو بێ
ویستە بەشێك لە عالەم لە دێ یەك دا یا لە شارێکدا بیکەن بە جەشنێکی
وا نیشانەی دیارو عالەم بزانێ جماعەت لە کوێ جا بە مقداری زۆری وە
کەمی ئەو جێ‌یە ئەگۆڕرێ ، ئەگەر هیچ‌کەس نەی کرد هەموو عالەمەکە
گوناه بار نەبێ ، وە بۆ ئەوە کە خێری جماعەت ببێ ئەبێ صفە کە مساوی
بکرێن وە هەتا ریزی یەکەم تەواو نەبێ لە پاشە وە رانەوەستن وە عالەمەکە
پاڵ وە یەکدا وەئیلا خێری جماعەت نابێ هەر وەکو بۆ خۆت نوێژ بە
تەنها بکەی وایە •

# « باسی نویژی جمعه »

خوای تەبارك وتعالا ئەفەرموێ « یـا ایها اللذین آمنـوا اذا نودی للصلاة من یوم الجمعة فاسعوا الی ذکر الله وذروا البیع ذلکم خیر لکم ان کنتم تعلملون فاذا قضیت الصلوة فانتشروا فی الارض وابتغوا من فضل الله واذکروا الله کثیرا لعلکم تفلحون » مانای ئەی ئەو کەسانەی کە باوەررتان بەدینی ئیسلام هەیە هەر وەختێك بانگ درا بۆنویژ لە رۆژی جمعەدا تێوە کۆشش بکەن بۆ بەجێ هێنانی نوێژی جمعە وە تەرکی کەسابەتو معامله بکەن ئەوە باشترە بۆ تێوە ئەگەر عەقڵتان هەبێ وە هەرکاتێك نوێژەکەتان کرد ئەو وەختە بلاو بن بەزەوی دا وە ئەو شتەی خوا بە قیسمەتی کردبێ داوای بکەن وە فکری خواشتان هەر لە دڵ دا بێ بۆ خاتری ئەهلی نەجات بن پێغمبەر «ص» ئەیفەرموو جمعە کردن حەجە بۆ ئینسانی هەژار وە ئەیفەرموو جمعە گەورەی رۆژانە لە خزمەت خوادا گەورەتـرە لە رۆژی جـەژنی قـوربان و لە جـەژنی رەمەزان وە لـە رۆژی جمعەدا پێنج رەووشتی تیا هەیە ، حەزرەتی ئادەمی تێـدا دروسـت کراوە وە لە رۆژی جمعەدا هاتۆتە خوار لە بەهەشت بۆ سەر ئـەرز وە لە رۆژی جمعەدا وەفاتی کردوە وە لە رۆژی جمعەدا سەعاتێك هەیە کـە دوعای تێدا گیرا ئەبێ مەگەر دوعای گوناه بێ یا قطعی رەحم بێ وە لـە رۆژی جمعەدا دونیا خراب ئەبێ وە ملائکەتی گەورەو ئاسمان و ئەرزو باوو کێوو بەرد صاحب رەحمن لە رۆژی جمعەدا .

( ابو موسی اشعری ) ئەفەرموێ بیستومە لە پێغمبەر «ص» ئەو وەختەکە دوعای تێدا گیرا ئەبێ لەو وەختەدا یەکە ئیمام دائەنیشێ لە پاش خطبەی یەکەم

هەتا نوێژ تەواو نەبێ و پێغمبەر «ص» فەرمویەتی هەر موسڵمانێك بمرێ لە رۆژی جمعەدا یا لە شەوی جمعە خوا ئەیپارێزێ لە ئـازاری گۆرر ، خوا بمان پارێزێ لە ئازاری قەبر • پێغمبەر «ص» فەرمویەتی خوا فەرزو واجبی کردوە لە سەر ئێوە جمعەکردن لە سەعات و مانگ‌و ساڵا هەتا دونیا خراپ نەبێ و کەسێك تەرکی بکا لەگەڵ ئیمامی عادل یا ظالم خوا جمع ناکا لە وەضعی ئەودا وە بەرەکەت نابێ لە ئیشی ئەو داونە نوێژی خێری هەیەو نە حەج‌و نە چاکەی ، پێغمبەر «ص» فەرموی جمعە واجبە لە سەرهەموو موسڵمانێك بێجگە لە سەر ژن و لە سەر منـداڵ و لـە سەر نەخۆش و لە سەر عبد نەبێ • پێغمبەر «ص» فەرمویەتی کەسێك دەست نوێژ هەڵگرێ لە رۆژی جمعەدا بە چاکی لە پاشان بێ بۆ جمعە بەبێ دەنگی دانیشێ گوێ لە خطبە راگرێ خوا خۆش ئەبێ لە گوناهی ماوەی بەینی ئەو جمعەیەو هەتا جمعەیەکی‌کە وە سێ روژیش زیاد بەلام‌کەسێك بەگاڵتەوە مشغول بێ یا بە سەر عالەمدابرڕواوسەرلە خەڵك بشێوێنـێ ئەو کەسە خێری جمعەی نی‌یە وە فەرمویە کەسێك سستی بکا بەجمعە سێ جار لە سەریەك نەی‌کا ئەو کەسە خوا دڵی مۆر ئەکاماناى رێی هەقی لێ ئەبەسترێ هەتا تۆبە ئەکا پێغمبەر «ص» ئەفەرموێ هەروەختێك رۆژی جمعە هات لە سەر هەموو دەرگای مزگەوت ملائکەت رائەوەستن عالەم ئەنوسن هەرکەس بە گوێرەی مەرتەبەی خۆی کەسێك زوو بێ خێری زووهاتنەکەی وایە وەکو ووشترێك بەخشێ کەسێك لە دواتر بێ وەکو رەشە ووڵاخ بەخشێ کەسێ لە دواتر بێ وەکو بەرانێ بەخشی کەسێ لـــە دوای تربێ وە کومزیشك بەخشێ کەسێ لـە

دواتربێ وه کـوهێلکەیەك بەخشێ پێغمبـەر «ص» فەرمویـە لـە رۆژی جمعەدا زۆر صلا واتان لە سەر من بلێن کەسێك ئەو ئیشەی کرد من دە رۆژی قیامەت دا شفاعەتی بۆ ئەکەم لە روایەتێك دا هەیە ئەفەرموێ کەسێك پاش نوێژی جمعە لەجێی خۆی لانەچێ هەشت جار بلێ «اللهم صلی علی محمد النبی وعلی آله وسلم تسليما» خوا خۆش ئەبێ لە گوناهی هەشتا ساڵی وە بۆی ئەنوسرێ عبادەتی هەشتا ساڵ وە فەرمویە صلوات لە سەرمن زۆر بلێن چونکە هەر کەسێك صلواتێکی ووت خوا دە رەحمەتی بۆ ئەنێرێ وە لە دە گوناهی خۆش ئەبێ •

## «مەرجی راست بونی جمعە»

پێ ویستە کە جمعە بە جماعەت بکرێ لە رکعاتی یە کەمدا و ئیمام نیەتی امامەت بێنێ و خەڵکەکەش نیەتی اقتدا کردن بە امام بێنێ وە ئەبێ چـل کـەس بن بالق بن وە موسڵمان بن وە بـیری بارکـردنیان نەبێ لەوجێگەیە وە لە ناو خانواندا بکرێ و تەواوی دووخطبە و دوو رکعەت لە وەخت دابێ ، هەر یەك جمعە بکرێ مانای هەموو خەڵکەکە لە جێگەیەك کۆبێنەوە مەگەر خەڵکەکە زۆر بێ و جێگایەك نەبوو هەمووبوەستن وەکو بەغدا وە ئەبێ لە پێش نوێـژی جمعە دا دوو خطبـە بـە زمانـی عەرەبی بخوێنرێن ئەگەرچی خەڵکەکەش لە زمانی عەرەبی تێ نەگەن ، وە روکنی خطبەکان ئەوەیە ئەبێ حمدی خوای تیدا بێت وە صلواتی لە سەر پێغمبەر «ص» تیدا بێ بە لفظی حمدو و صلوات وە وەصیەت کردن بۆ لـە خـوا ترسانی تیادا بێ لە هەردوو خطبەکەدا وە ئایەتێکیش لـە یەکێـك لـە خطبەکان دابێ وە لە خطبەی دووەمدا دوعای بۆ موسڵمانان تیا دابێ وە

خەتیب ئەبێ دابیشێ لە بەینی دوو خطبەکەدا وە قەراربگرێ کەمێك ، وە ئەرکان و خطبەکان لە گەڵ نوێژ بەینیان زۆر نەبێ ، وە خطیب دەست نوێژی هەبێ وە بە پێ وە خطبەکان بخوێنێ ، وە ئەو چل کەسەی کە جمعەیان پێك هێناوە ئەبێ گوێیان لە ئەرکانی خطبەکان بێ ، کەسێك دوو ماڵی هەبوو لە دوو جێگا لە هەر کامێکیان زۆر ئەبوو جمعەی لە وێ لە سەر واجبە ئەگەر لە هەردوو جێگا وەك یەك بووو ئەووەختەکە جمعە بوو لەکوێ حازربوو جمعەی وێی لە سەر واجبە •

## « ئاگادار کردنەوە »

حەرامە لە سەر پیاو بە کارهێنانی ئاوریشم وە ئەو بەرگەی کە بەشی زۆری ئاوریشم بێ بەکاتە بەری یا هەڵی واسێ بە دیواردا یاڵە ژێر خۆیدا رای خا وەکو ئاوریشم وایە بۆ حەرامی وە بەرگێك کە زەرد بکرێ بە عصفران یا بە زعفران •

## « باسی چوونە لای نەخوش »

پێغمبەر «ص» فەرمویە خوا لە رۆژی قیامەتدا ئەفەرموێ ئەی کوڕی ئادەم ئەمن نەخۆش‌بووم عیادەت نەکردم‌عبدیش‌عەرزی ئەکائەتۆخوای‌هەموو عالەمی چۆن عیادەت ئەکرێ ؟ خوا ئەفەرموێ نەت ئەزانی کەفلان عبدی من نەخۆش بوو عیادەت‌نەکرد ئەگەر عیادەت بکر دایە رەحمەتی منت دەست ئەکەوت ، پێغمبەر «ص» ئەفەرموێ سێ شت هەن بێ ویستن لە سەر موسڵمان عیادەتی نەخۆش و حازربوونی سەرجنازەو کەسێك بژمێ پێی بڵێن خوا رەحمت بێ بکا ئەگەر خۆی لە پێش دا بڵێ «الحمد لله»

وە ئەگەر ئینسان عیادەتی نەخۆشی کرد سبەینێ دوعای خێری بۆ ئەکەن حەفتا هەزار ملائکەت تائێوارە ئەگەر ئێوارە عیادەتی کرد تا سبەینێ دوعای بۆ ئەکەن ، بەلام چوونە لای فاسق و خراپ سوننەت نی‌یە وا چاکە کە چووی بۆ لای نەخۆش دلی خۆش بکەی وە خێری نەخۆشی پێ بلێی وە پێی بلێی سەبرت بێ وە ئەگەر ئارەزوی لە شتێکی خواردەمەنی بوو بۆی پەیدا بکەی ئەگەر بۆی زەرەر نەبێت وە عەیبی لێ نەگرێ لە هاوار کردنیا وە ئەگەر ممکن ئەبێ لێی حالی بکەی زکر چاترە ئەوە باشە وە هەروەها وا چاکە کە تۆش بە نەخۆش بلێی دوعام بۆ بکە چونکە پێغەمبەر «ص» ئەفەرموێ دوعای نەخۆش وەك دوعای ملائکەت وایە وە پێی بلێ انشاء الله گوناهت لائەچێ .

# « باسی خێری نەخۆش »

پێغەمبەر «ص» فەرمویە هەر ناڕەحەتی یەك کە تووشی موسلمان ئەبێ چ نەخۆش بێ و چ دل تەنگ بێ هەتاکە چەقلی دەبی ڕاچی ئەبێتە هۆی مەحو بونەوەی گوناهەکانی وە فەرمویە ئەگەر موسلمان نەخۆش بوو وە چاك بووەوە ئەبێتە هۆی ڕەش بوونەوەی هەر گوناهێکی لە پێشەوە کردویەتی بەلام ئینسانی منافق ئەگەر نەخۆشی بوو وە چاك بوە وە وەك وولاخ وایە کە لە پەت بەرئەبێت مانای هیچ گوناهێکی لە سەر لاناچێ چونکە ئیمانی نی یە وە فەرمویە خوا کە کەسێکی خۆش بوێ تووشی ناڕەحەتی دونیای ئەکا ، پێغەمبەر «ص» ئەفەرموێ لە ڕۆژی قیامەتدا

شهیدان حازر ئەکەن حسابیان لە گەڵ ئەکرێ وە ئەوانە کە چاکەیان کردوە حسابیان لە گەڵ ئەکرێ ، بەلام ئەوکەسانە کە لە دونیادا خاوەن بەلاو موسیبەت بوون حسابیان لە گەڵ ناکرێ خوا بە رەحمەتی خۆی خێریان بە سەردا ئەررێژێ وە هەتا ممکن ئەبێ وا چاکە نارەحەتی لە لای عالەم ئاشکرا نەکەی و پێغمبەر «ص» فەرمویە وا چاکە ئینسان کەنۆبەتیی هاتێ ئاوی سارد بە لەشی خۆیدا بکا چونکە ئەو گەرمی یە گەرمی دۆزەخە ، وە گەرمی بە ئاو ئەکوژێتەوە ، وە فەرمویە کەسێك نارەحەتی تووش بوو بە ماڵ یا بە نەفس لە لای خەڵك ئاشکرای نەکرد لازم ئەبێ لە خذمت خوا کە لێ خۆش بێ بە رەحمەتی خۆی •

## « باسی خراپی بە دەنگ گریان »

پێغمبەر «ص» ئەفەرموێ من بەریم لەوکەسەی کە دەنگ بلند بکا بۆ گریان یا مووی سەری خۆی لادەبا یا بەرۆکی خۆی ئەدررێنێ ، وە فەرمویە بە ئومەتی من حساب نی یە کەسێك کە لە دەم و چاوی خۆی بدا وە بەرووکی دا دررێ وە هاوار بکا وەك دەستوری زەمانی کفر ، وە فەرمویە ئەو وەصفە دەستوری زەمانی کفرە ، وە ئەو رنەی بە توندی بگری وە تۆبە نەکا وە لە سەرئەو حاڵەتە بمرێ خوا بەرگێکی ئاگرینی بۆ دروست ئەکا وە لەبەری ئەکرێ ، وە دوکلاوی لە بلێسەی ئاگر بۆ دروست ئەکا وەلەسەری ئەنرێ وە ئەوگریاوانەزیندو ئەکرێنەوە لەدۆزەخ دا کۆئەکرێنەوەوە حوکمیان لێ ئەکرێ کەبگرین لە سەر ئەهلی دۆزەخ ، وە دەنگیان وەکو دەنگی سەگ سەگ ئەبێ وە فەرمویە ئینسان

اکە ئەهلی خۆی لە سەر کۆبونەوە وە بۆی گریان بە توندی ئەو کەسە عەزاب ئەدرێ بەو مەرجە رراۆزی بێ لە وەختی خۆیدا •

## « باسی ئارام گرتن لە سەر بەلا

یەکێك لە کچانی پێغمبەر (ص) کوررەکەی نەخۆش بوو پیاوێکی نارد بۆ خزمەت پێغمبەر ، پێغمبەر «ص» فەرموی بررۆ بۆ لای ئەو کچە پێی بلێ باسەبر بکا خوا بەئارەزوی خۆی شت ئەبەخشێ‌وە بەئارەزوی خۆی وەری ئەگرێتە وە وە بۆ هەموو شتێك کاتی داناوە ، وە فەرمویە خوا ئەفەرموێ هەر وەختێکی خۆشەویستی عبدی خۆمم مراند وە ئارامی لە سەر گرت وە بیری وابوو کە من جەزای ئەدەمەوە جەزای ئەو بەهەشت ئەبێت ، وە فەرمویە کەسێك لە دونیادا تووشی تەنگ و چەڵەمە بوو ئەو تەنگ و چەڵەمەیە بە نەمانی من دەفع بکا چونکە تەنگ و چەڵەمە لە نەبونی من گەورەتر نی‌یە ئەجا زاناکان لەو حدیثەوانیان بۆ دەرکەوتوە کە پێ ویستە خۆشەویستی پێغمبەر «ص» زیاتر بێ لە خۆشەویستی خۆت و ماڵ و منال ، وە ئارامیش لە یەکەم جارەوە جەزای هەیە چونکە لە دوایی دا ئینسان بە طبیعەت خۆی چاك ئەبێ وە پێ ویستە وەکو پیاوی نەزان و خراپ نەکا هەتا ئەگەر دەست لە ئەژنۆی راکێشێ خێری نامێنێ ، پێغمبەر «ص» فەرمویە کەسێك سێ منالی نابالغی بمرن لە پێش خۆی دا ئەو منالانە ئەبنە باعثی پارێزگاری ئەو کەسە لەدۆزەخ «ابو الدرداء» عەرزی کرد ئەگەر دوومناڵ بن ؟ فەرموی ئەویش وایە یە کێکی کە عرضی کرد ئەگەر یەك بێ ؟ فەرموی ئەویش وایە ، روایەت کراوە کە حەزرەتی عمر

کورێکی وەفاتی کرد حەزرەتی عمر پێ‌کەنی عرضیان کرد چ وەختی پێ‌کەنینە ؟ ؟ فەرموی ئەمەوێ شەیتان لە خۆم دوور بخەمەوە وە هەم واچاکە کە کەسێك کە تەنگ و چەڵەمەی دونیای توش بوو چ مردن بێ چ زەرەری ماڵ بێ بڵێ : « انا لله وانا الیه راجعون اللهم اجرنی فی مصیبتی واخلف علی خیرا منها» چونکە خوا فەرموییە لە قورئاندا کەسێك ئەو دوعایە بخوێنێ لە طرف منەوە رەحمەتی بە سەرا ئەبارێ وە رێی بەهەشت یا خێری پێ نیشان ئەدرێ ، وە ئەگەر حەزرەتی یعقوب ئەو دوعایەی زانی بایە ئەی خوێند لەوکاتەداکەحەزرەتی یوسفی لەلا نەبوو وە نەی ئەفەرمو « یا اسفا » چونکە خوا ئەو دوعایەی هەر فێری پێغمبەرو قەومەکەی کردوە ، یارەبی خوا بمانگێرێ لەو کەسانە کەئارام ئەگرن لە خۆشی و ناخۆشی دا آمین ●

## « باسی تەعزیە »

پێغمبەر «ص» فەرموییە کەسێك سەرەخۆشی لە خاوەن مصیبەت بکا خێری ئەگاتێ و کەسێکیش سەرخۆشی لە ژنی خاوەن مردو بکا بەرگی پارچەی لە بەر ئەکرێ ، ئەصلی تەعـزی یەکـە بریتی یە لە وە کە بە صاحب مصیبەت بڵێی ئارام بگرە خوا جەزات بداتەوە وە دڵ تەنگی کەم بکەیت ، ئەوە سونەتە هەتا سێ رۆژ پاش ناشتنی مردوەکە لە دوای ئەوە مکروهە وە سونەتە تعزیە لە هەمو خزمی مردو بکەی مەگەر ژنی جحێڵ بێ وە سونەتە بۆ دراوسێی ماڵی مردوو خواردن دروست بکەن بۆماڵی مردە وە زۆر لە ئەهلی مردوو بکەن کە بخۆن بەلام حەرامە ... بکرێ وە خەڵکی زۆری لە سەر کۆبێتەوە بەتایبەتی زۆر

حەرامە نان و چێشت بدەی بەو ژنانە کە لە سەر مردوو ئەگرین چونکە ئەبێتە یاریدەدان لە سەر گوناهی ئەو ژنانە .

## « باسی زەکات »

هەقی تعالا لە قورئانی پیرۆزدا ئەفەرموێ « ویل للمشرکین اللذین لایأتون الزکاة » مانای ئازاری بە توندی هەیە بۆ ئەو کافرانە کە زەکات نادەن تەماشاکا خوا ناوی ئەو کەسانەی بردوە بە کافرکە زەکات نادەن وە هەروەها خوا فەرمویە « ولا تحسبن الذین یبخلون بما آتاهم الله من فضله هو خیرا لهم بل هو شر لهم سیطوقون ما بخلوا به یوم القیامة » مانای بیریان وانەبێ ئەو کەسانەی زەکات نادەن وە ماڵ کۆئەکەنەوە ئەوە قازانجە بەڵکو ئەوە زەرەرە بۆ خۆیانی خرر ئەکەنەوە وە طەوقی ئاگرین لە ئەستۆی خۆیان ئەکەن لە رۆژی قیامەت دا ، پێغمبەر «ص» فەرمویە کەسێك لە دونیادا خاوەنی زێرروزیو بووبێ وە زەکاتی تێ دا بووبێ وە زەکاتی لێ نەدابێ ئەو زێررو زیوە ئەکرێتە بەرگێکی ئاگرین وە لە بەری ئەکرێ وە داخ ئەکرێ بەو بەرگە پشت و تەنیشتی ، مانای لەشی ئەوکەسەگرر ئەگرێ ، ئەگەر پارەکەی زۆر بووبێ هەر وەخت ئەو بەرگە سارد بوەوە بەرگێکی کەی بۆ گەرم ئەگرێتەوە هەتا رۆژی قیامەت تەواو ئەبێ کە مقداری پەنجا هەزار ساڵە هەتا محاکمەی مخلوق تەواو ئەبێ ئەو وەختە یا بۆ بەهەشت یا بۆ دۆزەخ ئەنێرێ عرضیان کرد ئەگەر کەسێك ووشتری بووبێ یا بزن و مەرری بووبێ یا رەشە وولاخ وە

زەکاتی لێ نەدابێ وەضعی چۆنە ؟ فەرموی ئەو حیوانانە زیندو ئەکرێنەوە لە وەزعێکی زۆر بە قوەت دا صاحبی خۆیان نارزەحەت ئەکەن بە شاخ یا بە پێ کوڵ هەتا رۆژی قیامەت تەواو ئەبێ لە پاشا یا بۆ بەهەشت یــا بۆ دۆزەخ ئەچن •

«عبداللەی ئیمامی مسعود» فەرمویە ئێمە ئەمرمان پێ کراوە بە نوێژ کردن وە بە زەکــات دان کــەسێکیش زەکــان نەدا خێری نوێژی نــی‌یە وە کارێکی‌کە کەڵکی بۆ نادا •

# « باسی واجب بوونی زەکات »

پێ ویستە زەکات لە زێرردا لە کێشی بیست مسقاڵ دا نیو مسقاڵی تیا دا پێ ویستە وە لەوەو دوا هەرچەندێکی زیادبێ دووبارە چواریەکی دەیەکی تیادا واجبە کەم بێ یا زۆر بێ وە زەکاتی زیوێ ویست نی‌یە هەتا نەگاتە دووسەد درهەم کە بریتی یە لە سەدو چل مسقاڵ ئەو کاتە پێنج مسقاڵی تیادا واجبە وە لە وە زیاتر وەکو زێرر هەر چەندێك بــێ چواریەکی دەیەکی تێدا واجبە بەلام بەو مەرجەی کە ساڵی بەسەرا بێتەوە یا ئەو ماڵەی کە لە ژێر ملکایەتی خاوەنی دابێ وە واجبە کە ساڵی لێ تەواو بوو خاوەنی مولکایەتی‌یەکــە زەکاتەکە بــدا ئەگەر ممکن بوو وە ئەگەر نەیدا ئەو کەسە توشی گوناهێکی گەورە.ئەبێ وە ئەگەر صاحبی مانع بوو پێ ویستە بۆ گەورەی وەخت بە زۆر لێی بستێنێ وە پێ ویستە بۆ ئەوەی کە زە کاتت لە سەر لاچێ نی یەتی زەکاتی بێنی لە وەختی جوێ کردنەوەدا وە ئەگەر کەسێك هەموو ماڵی ببەخشێ و نی یەتی زەکــاتی

نەهێنێ هەر قەرزاری زەکات ئەبی وە ئەبی بدرێ بە موستەحقی خۆی وە ئەگەر بدرێ بە کافر یا بە دەوڵەمەند یا بە هاشمی یا بە مطلبی زەکات لاناچێ .

## « باسی خێر جگە لە خێری زەکات »

پێغمبەر «ص» فەرمویە چاکە بکەن چوونکە چاکە کردن باعثی رزگار کردنی ئێوەیە لە آگری دۆزەخ فەرمویە خۆتان دوور بخەنەوە لە ئاگری دۆزەخ با بەلەتە خورمایەکیش بێ ، ئەگەر هیچماڵتان نەبوو قسەی خۆش لەگەڵ خەڵکی بکەن وە فەرمویە صدقە کردن باعثی ئەوەیە ئینسان لەسەر شێوەی خراپ و بەد بەختی نامرێ ، وە ئینسان لە ژێر سێبەری خێری خۆی دایە لە رۆژی قیامت دا ، وە ئینسان پارێزگاری ئەکا لە گەرمایی قەبر «عبداللّەی ئیمام عباس» ئەفەرموێ کەسێك بەرگێك بدا بە موسڵمان هەتا پارچەیەکی ئەمێنێ ئەوکەسە لە ژێر پارێزگاری خوا دا ئەبێ وە هەچ کەسێك خواردەمەنی بدا بە موسڵمانان لە سەر برسێتی ئەو کەسە خوا لە رۆژی قیامەت لە میوەی بەهەشتی پێ ئەبەخشێ ، وە هەر موسڵمانێك ئاو بدا بە موسڵمانێکی تر لە سەر تینوێتی خوا لە رۆژی قیامەت دا لە حەوزی کەوثەر ئاوی ئەداتێ وە ئینسانکە صدقە لە حاڵی حیاتی دا بکا بە درهەمێك چاکترە لەوەی هەموو ماڵی خۆی بەخشێ بۆ پاش مردن ، وە فەرمویە هەرکەسێك دەرگای لێ بکرێتەوە بۆ داوای خێر خوا بەرەکەت بۆئەو ماڵە زیاد ئەکا ، وە هەرکەسێك پرسیار بکا بۆ زیادی ماڵ ئەو کەسە هەر بێ ماڵ ئەبێ وە «مهتوك»

ئەبێ لە بەر چاوی خەلکی وە ئەگەر لە بەر ئەوە ئەباکە سوال کەر درۆ ئەکەن زۆریان محتاج نین ئەگەر داوای درهەمێکیان کرد با لە یەکێك و ئەویش ئەیدابانێ لە ئەهلی نجات ئەدەبوو ٠

«عبداللە امام عمر» ئەفەرموێ کەسێك سوالیان لێ کرد بۆ خاتری خوا عطای کرد ئەو خێرە هەفتاو یەك بۆی ئەنوسرێ وە خێر کردن بەوونی ئە کوژێنێتەوە رقی خوا ، وە رەحم بەجێ هێنان عومر زیاد ئەکا وە ئەمر کردن بە چاکە لە مردنی خراپ دورت ئەخاتەوە ، وە پێغەمبەر «ص» فەرمویەتی ئێوە سوال کەر رەدمەکەنەوە بە شتێکی کەمیش بێ و بابە سواریش بێ ٠ «عبداللەی امام عمر» فەرموی ئەگەر ئێوە صدقەی سونەتان کرد خێری ئەو صدقەیە بۆ دایك و باوکتان بنێرن ئەوکاتە خێرە کەیان بۆ ئەچێ وە هیچ لە خێری ئێوەش کەم نابێتەوە وە دیاریشە کە ئینسان مرد نە خێر نە شەرری بۆ نانوسرێ بەلام حەوت خێر بۆ ئینسان ئەنوسرێ کەسێك مەسەلەی دینی فێری کەسێك بکا یا جۆگای ئاو پەیدا بکا یا بیرێك هەڵ بکەنێ بۆ ئاو یا درەختی صاحب بەر برروێنێ یامزگەوت دروست بکا یا قرآن یا کتێبی شرعی وقف بکا یا منالی موسلمانی لە پاش بێ دوعای بۆ بکا ، ئەو خێرانە پاش مردنیش هەر ئەمێنن ٠

## « مەتحی سەخاوەتو زەمی بەخیلی »

پێغەمبەر «ص» فەرمویە سخاوەت درەختێکە لە درەختی بەهەشت کەسێك دەست بە لقی ئەو دەرختە بگرێ ئەولقە ئەی کێشێ بۆ بەهەشت ، بەلام بەخیلی درەختێکە لە دەرختی دۆزەخ کەسێك دەستی بە لقی ئەو

درەختە بگرێ ئەو لقە ئەی کێشێ بـۆ دۆزەخ ، وە فەرمویە بەهەشت جێگای پیاوی مسڵمانی سەغی یەو فەرمویە سـەغی مرتبەی نزیکەلەخوا و نزیکە لە عالەم و نزیکە لە بەهەشت و دوورە لە دۆزەخ بەلام بەخیل دوو رە لە خواو دوورە لە عالەم و دوورە لە بەهەشت وە نزیکە لە دۆزەخ وە جاهلی سەغی زۆرخۆشەویست ترە لە خزمەت خوا لە عابدی بەخیل «سلمانی فارسی» فەرمویە ئەگەر پیاوێکی سەغـی مرد ئەرزو ملائکەت ئەڵێن ئەی خوایە خۆش ببە لەو عەبدە بە هۆی سخاوەتی ، ئەگەر بەخیل مرد ئەڵێن خوایە ئەو عەبدە وون‌کە لە بەهەشت چونکە ئەویش لە دونیادا نعمەتی تۆی وون ئەکرد لە عالەم معلومە سەخاوەت لەو سیفەتانەیە کـە مقبوڵن چونکە سەخاوەت صفەتی پێغمبەر «ص» بووە وە هیـچ‌کەسێك بەمقداری ئەوزاتە موبارەکە سەغی نەبووە هەتا سەغی تر بووە لە هەورێ کە ئەبارێنێ وەصفی سەخاوەت لە پێغمبەر «ص» مشهورەو لە سەحابە رێزگیراوە کانیش دووبارە بە زۆری سەخاوەت رووی داوە هەتا جارێك بحەزرەتی ابو بکر هەموو ماڵی خۆی‌کرد بە خێرات عرضیان‌کرد بۆماڵو منالْ چیت هێشتۆتەوە ؟ فەرمووی خوام باقی ماوە ٠

## « باسی میوان داری »

پێغمبەر «ص» فەرمویە هەر کاتێك میوان چوو بۆ لای قەومێك رزقی خۆی لە گەڵە وە ئەگەر لە ناویان رۆیشت خوا لەکوناهی ئەو قەومە خۆش ئەبێ وە فەرمویە ئەگەر خوا مەبەستی ئەوەبێ کەسێك تووشی چاکە بێ میوانی بۆ ئە نێرێ چونکە میوان رزقی خۆی لە گەڵ دێت وە لە گوناهی

خاوەن ماڵ خۆش ئەبێ ، وە فەرمویە لـە هەموو صدقەی کـە زۆرزوو ئەڕوا بۆ ئاسمان مانای گیرا و قبوڵ ئەکرێ ئەوخێرەیە کە خواردنێکی حەلاڵت هەبێ برای موسڵمان بانگ بکەی بۆ سەر ئەوخواردنە وە هەتا ئەو سفرە راخرابێ ملائکەت دوعا بۆ خاوەن سفرە ئەکـەن وە فەرمویە اکەسێك حیوانێك سەر بڕێ بۆ میوان ئەبێتە باعثی رزگـاربوونی لـە دۆزەخ .

## « باسی منەت کردن لە سەر خەڵکی »

خوای گەورە ئەفەرموێ . یاأیها الذین آمنوا لاتبطلوا صدقاتکم بالمن والاذی کالذی ینفق ماله رئاء الناس ولا یؤمن بالله والیوم الاخـر فمثله کمثل صفوان علیه تراب فاصابه وابل فترکه صلدا لایقدرون علـی شیء مما کسبوا والله لایهدی القوم الکافرین ، مانای ئەی موسڵمانینە ئێوە چاکەی خۆتان بە تاڵ مەکەنەوە بە هۆی منەت کردن مانای بـاس کردنی چاکەی خوتان لە لای خەڵکی ، چـونکە ئەبێتە ئازاردانی دڵـی ئەوکەسە کە چاکەت لە گەڵ کردوە ، وە خێری ئەو کەسە بە تاڵە کـە بۆ ریایی و احترامی ناو خەڵکی ئەو ماڵەی خۆی ئەبەخشێ وە لە راستی داباوەڕی بەخواو بە ڕۆژی قیامەت نی یە ، وە وینەی ئە کەسانە هـەر وەکو بەردێکی صاف لووس وەهایە کە گڵی لە سەربێ وە بارانی پێ دا بارێ وە ئەوگڵەبشواتەوە ، هیچسوود وەر ناگرن لەوخێرانەیکە بە ریا کردویانە وەمعلومەکە خوا هدایەتی ئەو کەسانە نادا کە بۆ خۆی ئەزانێ قەبوڵی ایمان ناکەن ، جا کە وابێ ئەوە معلوم بوو کە ذاتی حـق تعـالا جەزای خێری بۆ کەسێك قەرار داوە کە منەت لە سەرخەڵکی نەکا وە

ئازاری دلی ئەوکەسە نەدا کە چاکەی لەگەڵ کردوە هەتاوەکو حەزرەتی
عایشە ئەگەر چاکەی لەگەڵ سواڵ کەردا بکردایە پیاوی بە دوادا ئەنارد
کە بزانێ ئەگەر دوعای بۆ حەزرەتی عایشەکرد ئەو کاتە حەزرەتی
عایشە دوعای بۆ ئەکردەوە وە هەتا وا چاکە کە چاکەت لە گەڵ کەسێك
کردبێت ئەگەر وابوو کە سەلامی لێ بکەی خەجاڵەت ئەبێ ئەو کاتە
سلامی لێمەکە با خەجاڵەت نەبێ پێغمبەر «ص» فەرمویە سێ کەس لە
رۆژی قیامەت خوا قسەیان لەگەڵ ناکاوە بە رەحمەت تەماشایان
ناکا وە ئازاری بە شیدەتیان هەیە، ئەو کەسە کە بۆ فیز بەرگی درێژ
ئەکاو ئەوکەسە کە چاکەو بەخشین ناکا ئیلا بە منەت نەبێ وە
درێژ ئەکاو ئەوکەسە کە چاکەو بەخشین ناکا ئیلا بە منەت نەبێ وە
ئەوکەسەکە رەواج بە شتومەکو مەتاعی خۆی ئەدا بە سوێندی درۆ وە
فەرمویە خوا قبوڵ ناکا لە رۆژی قیامەت نە خێرو نە نوێژی ئەو کەسانە
کە بێ ئیطاعەتی دایك و باوکیان کردبێ یاوەکو منەتیان بە سەر خەڵکدا
کردبێ یا قەزاو قەدەریان بە درۆ زانی بێ، پێغمبەر «ص» فەرمویە ئەی
ئومەتی محمد بزانن کە قەسەم بە وەی کە منی کردوە بە پێغمبەر خوا قبوڵ
ناکا خێری ئەو کەسە خزمی هەژاری هەبێ وە چاکە لە گەڵ بێگانە بکا،
پێغمبەر «ص» فەرمویە کەسێك کە ضمانت بکا سواڵ نەکا ئەمنیش ضامنی ئەو
ئەکەم بۆ بەهەشت وە فەرمویە کەسێك هەژار بوز وە شکاتی هەژاری خۆی
برد بۆ لای خەڵك ئەوااحتیاجی لانچی بەلام ئەگەر شکاتی بۆ لای خوا بەرێ
خوا رازی ئەکا، فەرمویە هەتاوە کو ممکن هیچ داوایەك لە خەڵك مەکە
ئەگەر شتێکت لە دەست بەر بوەوە مەڵێ بیدەرەوە دەستم بەڵکو بۆ خۆت

هەڵێ بگرەوە ، وە سواڵ کردن حەلال نی یە بۆ کەسێك خۆی بە پیاو بزانێ یا خاوەن ماڵ بێ مانای نانی ئێوارەو بەیانی هەبێ ، بەلام کە موستحقی زەکات بێ کەبێ ی بشێ خۆی زەکات داوا بکا ئەوە زەرەری نی یە مەگەر کەسێك نەفەقەی ساڵێکی هەبێ ، وە پێغمبەر «ص» فەرمویە خوا ئەبوغزێنێ ئەو کەسەی کە سواڵ بکا بە زۆری کردن وە فەرمویە ملعونە ئەو کەسەی سواڵی لێ ئەکەی وە هیچ نادا ، وە ئەفەرموێ ئەو کەسە لە خراپ ترینی ئومەتی من حساب ئەکرێ کە سواڵیان لێ بکرێ بۆ خاتری خوا وە دریغی بکەن لە بەخشینی .

## « باسی واز هینان لە دونیا »

خوای گەورەو میهربان فەرمویە :

« من كان يريد حرث الاخرة نزد له في حرثه ومن كان يريد حرث الدنيا نؤته منها وماله في الاخرة من نصيب » مانای کەسێك مەبەستی بێ کە سوودی قیامەتی دەست کەوێ موفەقی ئەکەین وەکو لە جێگەیەکی کەدا ئەفەرموێ « واللذين جاهدوا فينا لنهدينهم سبلنا » وە کەسێك هەر مەبەستی سوودی دونیا بێ پێ ی ئەبەخشین بەلاّم لە قیامەت دا هیچ بەشێکی نی یە .

«عبداللەی امام عمر» فەرمویە جارێك پێغمبەر «ص» شانی گرتم فەرموی یا عبداللە لە دونیادا خۆت وا حساب بکە کە شەخصێکی غەریبی یا بە رێگادا ئەررۆی مانای ئولفەتی دڵی خۆت مەدە بە دونیا وە ئەگەر گەیشتیتە ئێوارێ بیرت وەهانەبێ کە بۆ بەیانی زیندوو ئەبێ وە ئەگەر کەوتیتە بەیانی بیرت وانەبێ کە بۆ ئێوارە زیندو ئەبی ، وە ئیش و کاری چاك بکە لە

وەختی ساغی بۆ وەختی نەخۆشی وە لە وەختی زیندویەتی دا بۆ وەختی مردن وە وەختی خۆت بە فیرۆ مەدە بە هەواو هەوەسی دونیا ، پیاوێك هات بۆ خزمەت پێغەمبەر «ص» عەرزی کرد شتێکم پێ بلێ کە نەجاتم بێ و بە جۆرێکی وابێ خوا منی خۆش بوێ و خەلْك منی خۆش بوێ ، فەرموی دونیا کەم بگرە پێش خۆت وە تەماع و چاوت لە شتی خەلْك دا نەبێ : ئێوە تەرکی دونیا بکەن چونکە هەر کەسێ زیاد لە مەسرەفی دونیا کۆبکاتەوە ئەوەمشغولی کوشتنی خۆیەتی وە عەقلی پێ ناشکێ ، ئایا نابینی ئەو کەسانەی کە مالی دونیا کۆ ئەکەنەوە خەلْك چەند خەریکە کە فێلیان لێ بکەن وە بیان فەوتێنن وە مانای واز هینان لە دونیا ئەوە نی یە کە شتێك خوا بۆی حەلال کردوی نەی خۆی وە مالی خۆت بە فیرۆ بدەی • بەلکو عەقیدەت وابێ کە ئەو شتەی کە ئێستا هەیە لە گەل ئەو شتەی کە ئێستا نی یە لای خوا هەر یەکێکە وە لەلات وابێ کە خێری موسیبەت وە نارەحەتی کە بە سەرت دا دێ دوایی یەکەی باش ترە لەوەی کە توش نەبێ موسیبەت وە تەماعی دونیا هەر غەم زیاد ئەکا ، بەلام وازهێنانی ئارەزۆی دونیا دل و لەش ئاسودە ئەکا وە بە پێ ئیش دانیشتن دلت رەق ئەکا •

پێغەمبەر «ص» فەرمویە : خۆتان دور خەنەوە لە خۆشەویستی دونیایە ئەوەندی کە ممکن ئەبێت چونکە کەسێك دونیا بکا بە مەبەستی زۆری خۆی مالی پەرێشان ئەبێ ، وە هەموو کاتێك هەزاری لە بەر چاویەتی • بەلام کەسێك مەبەستی خۆی بکاتە اموری قیامەتی خوا مالی بۆ دکۆ کاتەوە وە دەولەمەندی ئەکاتە دلی یەوە وە هەر کەسێك بە دل روو لە خوا بکا خۆشە ویست ئەبێ لە بەرچاوی عالەم وە خوا چاکە بۆ ئەو کەسە ئەبارێنێ ،

حەزرەتی عائشە فەرمویە پێغمبەر «ص» هەتا عومری بووتێری نەخوارد لـە گەڵ ئەوەش ئارەوزوی بوایە هەمو کێوی ئەرزی بۆ ئەبوونە آلتون وەهەموو کات هەزاریی پێ‌خۆش تر بوولە دەوڵەمەندی حەزرەتی عایشە فەرمویە جار بە جار بۆی ئەگریام کەوا خۆی برسی ئەکرد وە لە سەر حەسیرێ دانەنیشت عەرزمان ئەکرد قوربان بـا جێگەیەکی خۆشت بۆ حازر بکەین کە ماندوت لێ بحەسێتەوە ، ئەیفەرموو عایشە من چ مەبەستمە دونیا برایانی من کە پێغمبەرەکانی رابوردون ئارامیان بوە بە تونگ تر لە نارەحەتی من ، بە خزمەت خوا گەیشتون و خوا قەدری گرتون وە جەزای پێ نیشان داون جاکە وابوو منیش حەیا ئەکەم لە دونیادا بە ئیستراحة رابوێرم ، وە ووتراوەکە حەزرەتی سلێمان ئەم هەموو عەزەمەتەی کە بوویەتی بە عومری خۆی سەری بەرز نەکردۆتەوە بۆ ئاسمان لە ترسی خوا وە هیچ کاتێك خواردنی خۆشی نەخواردوە وە تێر نەبووە نەکو ئەوانەی کە برسین ئەو بیری بچن ، جارێك حەزرەتی عایشە پە نجاهەزاری بەخشی لە گەڵ ئەوەش بەرگێکی خۆی پینە کرابوو .

## « باسی گەورەیی هەژاریی »

پێغمبەر «ص» فەرموی ئەی کۆمەڵی هەژاران موزدەبێ لە ئێـوە کە موسڵمانی هەژار ئەچنە بەهەشت لە پێش دەوڵەمە ندان دا بە پێنج سەد ساڵ هەژارەکان لە بەهەشتا لەزەت ئەکـەن ودەولەمەندەکان حسابیان لـە گەڵ ئەکرێ پێغمبەر «ص» فەرموی چاوم بە بەهەشت کەوت زۆری ئەهلی بەهەشت فەقیر بوون وە چاوم بە دۆزەخ کەوت زۆری ئەهلی ئەوێ ژن بون ، وە ئەی فەرموو ئەوکەسەی لە ئێوە لە دونیادا بێ غەم بێ‌و لە زەنیلی

دایێ لە قیامەت دا خاوەنی غەم و نارەحەتی ئەبێ ۰ وە ئەوەش کە لە دونیادا نارەحەتی وغەمی هەبێ لە قیامەتدا حاڵی خۆش و بێ غەم ئەبێ ، وە فەرمویە زۆر گوناهی وا هەیە کە بە نوێژو رۆژوو مەحوو نابنەوە بەلام بە ئازار بردن لە دا وا کردنی نەفەقەدا مەحوو ئەبنەوە کە خوا دونیای دروست کرد رووی خۆی لێ وەرگێررا فەرمووی سوێند بە گەورەیی خۆم تۆ تەسلیم بە خراپ ترین عالەم ئەکەم ئەگەر دونیا بە قەدەر باڵی مێشوولە نمودی بایە خـوا پیاڵە ئاوێکی نەئەدا بە کافر جارێك حەزرەتی جبرائیل هات بۆ لای پێغمبەر «ص» فەرموی خوا سەلامت لێ ئە کا وە ئەفەرموێ خەبەرم داوە بە دونیا کە زۆر نارەحەت و بە توندی بە لە سەر ئەو کەسانە کە خۆشەویستی ئیمەن بۆ خاتری ئەوەی هەموو کاتێك روویان لە من بێ وە دڵیان بە تۆوە نەبەستریێ چونکە من دونیام دروست کردوە بە بە هەشت بۆ کافر وە بـە حەبس بۆ پیاوی موسڵمان ۰

## « باسی چونیەتی رەمەزان »

خوای گەورەو میهرەبان ئەفەرموێ « یا ایها اللذین آمنوا کتب علیکم الصیام کما کتب علی اللذین من قبلکم لعلکم تتقون ایاما معدودات » پێغمبەر «ص» فەرمویە مانگی رەمەزان خوا پێ ویستی کردوە کە بە رۆژو بن وە خێرە شەوی رەمەزان بە خەبەربن ، وە ئەفەرموێ کەسێك رۆژوەکانی بگرێت وە شەو بە خەبەر بوو مانای تەراویح کردن وە بیری چاکی هەبوو بەخوا کە جەزای ئەداتەوە ئەوا ئەوکەسە لە گوناە پاك ئەبێتەوە وەکو ئەو رۆژەی کە تازە لە دایك بووە ، «عبداللە‌ی ئیمام عباس» فەرمویەتی بناغەی ئیسلام سێ‌شتە کەسێك واز لە یەکێك لەوانە بێنێ موسڵمانی تەواو نی یە وە خوێنی

حەلاله یەکێك لەو سێ شتانە ئەوەیە کە بلێ « اشهد ان لا اله الا الله واشهد ان محمدا رسول الله » وە نوێژی فەررز بکەی وە ڕۆژووی ڕۆژانی ڕەمەزان بگری پێغمبەر «ص» فەرمویە : خوا ئەفەرموێ هەر یەك چاکە بە رامبەر دە چاکە ئەنوسرێ هەتا ئەبێتە حەوت سەد پلە ، بەلام ڕۆژوو بە تایەبەتی بۆ منە وە من ئەزانم جەزای چەندەو کەسێکی کە نازانێ ، ڕۆژوو گرتنی ڕەمەزان مەتاڵە بۆ ئاگری دۆزەخ وە فەرموی سوێند بە خوا بۆنی زاری خاوەن ڕۆژوو لە خزمەت خوا خۆشترە لە بۆنی مسك ، ئەگەر نەزانێك قسەی خراپی کرد تۆ قسەی خراپ مەکە وە بلێ من بەرۆژووم ، وەبۆ پیاو وژنی بەرۆژوود دوو خۆشەهەن یەکێکیان کاتی ڕۆژوو شکاندنەوە دوەمیان بە خذمەت گەیشتنی خوا لە ڕۆژی قیامەت کە جەزای ئەداتەوە وە فەرمویە : ئەگەر یەکەم شەوی ڕەمەزان هات شیاطین زنجیر ئەکرێن وە دەرگای جهنم دا ئەخرێ وە ناکرێتەوە هەتا ڕەمەزان تەواو ئەبێ وە مەلائیکەتێك بانگ ئەکا : ئەی ئەوکەسەی خێرت ئەوێ ڕوو لە خوای خۆت بکە ، وەئەی ئەو کەسەی طالبی گوناهی دەست کورت کەوە ، وە لە هەموو شەوێکی ڕەمەزان خوا چەند کەسێك عەفو ئەکا کە مستحقی جەهەنەمن ، «حەزرەتی عومەر» ئەفەرموێ : کەسێك ذکری خوا بکا لە ڕەمەزان دا خوا لە گوناهی خۆش ئەبێ وە ئەگەر داوایەك لە خوا بکا هیچ زەرەرێك ناکا ، وە نوستنی ئینسانی بە ڕۆژو عبادەتە وە بێ دەنگ بونی تسبیحاتە ئیشێکی چاکە بکا زیاد ئەکا وە دوعای قبوڵ ئەبێ وەگوناهی مەحو ئەبێتەوە ، «عبدالله ئیمامی عەمەر» فەرمویە : بۆ هەموو عەبدێکی بە ڕۆژوو دوعا گیرا ئەبێ لە وەختی ڕۆژوو شکاندن دا وە لە دنیادا پێی عطا ئەکرێت یا بۆی دوا ئەخرێت بۆرۆژی قیامەت جارێك پێغەمبەر

«ص» خطبەی بۆ موسلمانان خوێندەوە فەرمووی : ئەی موسلمانینە ئەوا بە سەر ئێوەدا هات مانگێکی گەورەو پیرۆز ، لەو مانگە دا هەیە شەوی « ليلة القدر » خێری کردەوەی ئەوشەوە یەك بە هەزارە ، وە ئەو مانگە رۆژوە کەی واجبە وە تەراویحی سونەتە وە کەسێکی سنتی تیدا بکا وە کوفەرزی پێجگە رەمەزان وایەکەسێکێ فەرزی تێدا بکا خێری حەفتا فەرزە پێجگە لە رەمەزانی هەیە ئەو مانگە مانگی ئارام گرتنە وە ئارام گرتنیش جەزای بەهەشتە ، وە مانگێکە رزقی تێدا زیاد ئەبێ ، کەسێك افطاری بدا بە کەسێکی بە رۆژو ئەوە ئەبێتە هۆی ( باعثی ) لێ خۆش بوونی گوناهەکانی وە رزگارکردنی خۆی لە جهەنەم و خێری خاوەنی رۆژوی پێدەگا بەبێ ئەوە لە خێری خاوەن رۆژوو کەم بێتەوە وەتیان : هەمومان دەستمان ناڕوا کە خواردەمەنی بدەین هەتا تێر ئەخوا فەرموی ئەو خێرە بۆ کەسێکە کە بەر بانگ بدا بە کەسێك بە رۆژووبێ ئەگەرچی دەنکە خورمایەك بێ یا پیالە ئاوێك بێ یا هەندێ شیر بێ ، وە ئەو مانگە مانگێکە هەوەڵەکەی رەحمەتە نیوە راستی مغفرەتە دواییەکەی رزگاربونە لە دۆزەخ وە زۆر بە جێ بێنن ، لەو مانگەدا چوار خصلەت دوو خصلەتی خوای پێ رازی ئەکەن وە دوو خصلەتە کەی تر کە بۆیان زەرورن بەڵام ئەو دوو خصلەتانەی کە خوایان پێ رازی ئەکرێ بڵێن « اشهد ان لا اله الا الله » وە بڵێن : « استغفر الله » وە ئەو دوو خصلتانەی کە بۆیان زەرورن ئەوەیە کە داوا لە خوا بکەن بۆ پلەی بەهەشت وە پەنا بگرن بە خوا لە ئاگری دۆزەخ ، کەسێك ئاوا بدا بە پیاوی بە رۆژوو خوا ئاوی ئەداتێ لە حەوزی کەوثەر کە هیچ کاتێکی کە تینوی نابێتەوە ، وە حەزرەتی جبرائیل تۆقەی لە گەڵ ئەکا ئەوە نیشانەی ئەوەیە ئەو کە سە دڵی نەرم

ئەبێو فرمێسکی دێنە خوارێ وە بۆ رێز گرتنی رەمەزان وا پێویستە کـە ئەگەر پێجگە لە رەمەزانیش بێ پاك بی ، لە رەمەزان دا پێویستە سەرنج زۆر بکەی وە تۆبە بکەی وەکو هەندێ ئەهلی علم گێرراویانە تە وە کابرایەك هەبوو ناوی «محمد» بوو قاعدەی وابو نوێژی نە ئەکـرد بەس کەم نەبێ بەڵام کە مانگی رەمەزان ئەهات خۆی جوان ئەکرد بە بەرگـی باش و بۆن خۆش وە رۆژووی ئەگرت وە نوێژی ئەکرد هەرچی فەوتا بو قەزای ئەکردە وە وە هەندێ زانایەکە ئەڵێ منیش پێم ووت بۆ وا ئەکەی ووتی ئەو مانگە مانگی تۆبەیە وە مانگی رەحمەتە وە جێی بەرەکەتە ، تکام وایە کە خوا لێم خۆش ببێ بە گەورەیی خۆی ، ئەوکەسە مرد وە لە خەودا چاویان پێکەوت وەپێ یان ووت خوا چی لە گەڵ کردیت ؟ ووتی خوا لێم خۆش بوو بە هۆی حورمەتی رەمەزان ، یا خوا خوایە خۆشبی لە ئیمەش و موسڵمانان ئامین ٠

## « باسی حوکمی روژوی رەمەزان »

پێ ویستە نیی یەت هێنان بۆ هەموو رۆژێك لە شەوا ، وە پێ ویستە ئەوەندە بە دڵت دابێ بە زمانیش بڵێت «نیی یەتم» هەیە بە رۆژوو ئەبم لە باتی «رەمەزان» وە تەواوی ئەوەیە بڵێ نیی یەتم هەیە بە رۆژوو ئەبم سبحەینێ لە باتی فەرزی رەمەزانی ئەم ساڵە بۆ خوای گەورە «الله اکبر» وە ئەو شتەی رۆژوی پێ ئەشکێ لە رۆژدا بەی خۆی ٠

# « سوننەتی ڕۆژوو »

سوننەتی ڕۆژوو یەکەمیان ئەوەیە پارشێو بکەی وە بە خورما چاکترە وە سوننەتی پارشێو پێك دێ یا بە ئاوخواردنەوە بێ ، وە کاتی پارشێو لە نیوەی شەو بە دواوەیە وە دوا خستنی پارشێو چاکترە هەتا شکی ڕۆژ پەیدا نەبێ ، پێغمبەر «ص» فەرمویەتی خواردنی پارشێو بەرەکەت پەیدا ئەکا وازی لێ مەهێنن یا بە پیاڵە ئاوێکیش بێ ، چونکە خواو مەلائکەت ڕەحمەتیان ئەنێرن بۆ سەر ئەوکەسانەی پارشێو ئەکەن وە فەرمویەتی باشترین ڕەوشت بۆ ئینسانی بە ڕۆژوو سواك کردنە ، فەرمویە هەرکاتێك بە ڕۆژوو بووی سواك بکە پێش نوێژی نیوەڕۆ بەلام پاش نوێژی نیوە ڕۆ سواك مەکەن چونکە ئەوبۆنەکە لە زاری خاوەن ڕۆژو دێ خوشەویست ترە لە خزمەت خوا لە بۆنی مسك وە ئەگەر سواك بکەی ئەو بۆنە نامێنێ وە سوننەتە زوو ڕۆژوو بشکێنیهەر ئەوەندە لێت دیاری بێ کە هەتاو نەماوە لە پێش نوێژ کردن ڕۆژووبشکێنە بەسێ خورمای تەرر یا خورمای ووشك یا سێ قومە ئاو وە لە پاش ڕۆژووشکاندن دوعا بکە بلێ «اللهم لك صمت وبك آمنت وعليك توكلت ورحمتك رجوت واليك تبت ذهب الظمأ وابتلت العروق وثبت الاجر ان شاء الله» پێغمبەر «ص» فەرمویە خۆشەویست ترین بەندەی من ئەوانەن کە زوو ڕۆژوو ئەشکێنن وە فەرمویە ئەو خەڵکە هەر لە سەر دەستوری من معامله ئەکا هەتا تەبیعەتیان ئەگۆڕرێ بە جۆرێك هەتا ئەستێرە دیار نەکەوێ ڕۆژوو ناشکێنن ، وە سوننەتە لە ڕەمەزان دا قورئان زۆر بخوێنن وە خێرات زۆر بکەن وە خزمەتی خزم و کەسو کار باش بکەن وە

جاکە لە گەڵ دراوسێ دا بکەن وە لە رەمەزان دا بە تایبەتی لە رۆژەکانی دوایی دا « اعتکاف» لە مزگەوت بکەن وە سونەتە لە هەموو رەمەزان دا ئەو دوعایە بخوێنن کە پێغمبەر «ص» فێری حەزرەتی عایشەی کرد فەرمووی لە رەمەزان دا بە تایبەتی لە شەوی«لیلةالقدر» دا بڵێی «اللهمانكعفو تحب العفو فاعف عنى » وە پێ ویستە بۆ ئینسانی بە رۆژووخۆی منع بکا لەو شتانەی کە لە پێش رۆژوودا بۆی حەلاڵ بون وەکودەنگی خۆش وە شتی جوان وە شتی بۆن خۆش وە هەروەها غوسڵی لەش پیسی بکا لە شەو دا وە لە خواردن ئەچێژێ وە نان ئەجوێ وە نان ئەجوێ بۆ منداڵ وە زمانی خۆی بپارێزی لە قسەی خەراپ ٠

## « ئەو شتانەی روژو بە تال ئەکەنەوە »

یەکەم شتێکی خاوەن جورم بچێتە ناو لەش بە کونی عادەتی دا یاخود بە قەستی خۆت بررشێنیتەوە یا بە قەستی مەنی خۆت بێنیتەوە یا جماع بکەی بە قەستی وە بش زانی کە حەرامە و رۆژوی پێ ئەشکێ وە پێ ویستە ئەو رۆژە بگێرریتەوە وە لەو رۆژەش دا هیچ نەخوا ، وە کەسێك لە شە وا نیەتی لە بیر چوو رۆژوەیەی بە تاڵە وە نابێ لە رۆژیش دا هیچ بخوا یا ئەکەسێك پارشیویی ئەکرد وە دیاربوو کە رۆژە وە یا سیی ٣٠ مانگی شەعبان بوو خەبەر هات مانگ دیار کەوتوە وە دیویانە کە زانیت نابێت هیچ بخۆی وە لەو شتانەیە کە رۆژوو بە تاڵ ئەکەنەوە بە قسەی زانایانی دین درۆ کردن لە رۆژدا ، غەیبەت کردن ، جنێو دان ، چونکە پێغمبەر «ص» فەرمویە کەسێك لە رۆژدا قسەی درۆ تەرك نەکات خوا هیچ مەقصدی

نی‌یه که ئەو نان و ئاو تەرك بکا وە فەرموویە زۆر رۆژو هەیە بێجگە لە تینوو بوون و برسی بوون نەبێ بۆ خاوەن رۆژووهیچی بۆ نامێنێتەوە بە راستی رۆژو مانای وایە که مەنع بێ لە هەر شتێکی نەفسی ئینسان پێ‌ی خۆش بێ •

## « باسی حەج کردن »

خوای گەورەو میهرەبان فەرموویە « ولله علی الناس حج البیت من استطاع الیه سبیلا» مانای پێ ویستە که ئینسان ئەرکانی حەج بەجێ بێنێ بۆ رەزا بوونی خوا ئەگەر توانای سەفەر کـردنی هەبێ بەو مانایە ئەبێ زیادی هەبێ لە خەرجی ماڵ و منداڵی هەتا ئەچێت و دێتەوە وە لە قەرزی زیادی هەبێ پێغمبەر «ص» فەرموویە ئەی موسڵمانینە خوا فەرزی کردوە لە سەر ئێوە حەج کردن وە لە تەمەنی دا یەك جار هەرکە سێك حەج بەجێ بێنێ لە رێگادا قسەی خراپ نەکا وە بێ دینی نەکا لەگوناهان پاك ئەبێتەوە وەکو ئەو رۆژەی لە دایك بووە ، عومرە کردنیش وەکو حەجێ ویستە لە تەمەندا یەك جار ، لە عومرە کردنا هەتا عومرەیەکی که کەفاررەتی گوناهە بۆ مابەینی ئەو دوو عومرەیە وە فەرموویە حەجی گیرا کراو جەزای هیچی کەی نی‌یە بێجگە لە بەهەشت نەبێ وە دیسان فەرموویە کەسێك بێت بۆ حەج وە مەبەستی غەیری رەزا بوونی خوا هیچی تر نەبێ خوا لەگوناهی رابردوو و دوایی خۆش ئەبێ وە شفاعەتی لێ قبوڵ ئەکرێ بۆ کەسێك که دوعای بۆ بکا • حەزرەتی علی فەرموویە کەسێك پێ‌ی بکرێ بێت بۆ حەج وە حەج نەکا ، هیچ دوور نی‌یە که بە گاوری یا بە جوولەکەیی بمرێ ، وە حەزرەتی عومەر فەرموویە بیرم وایە چەند کەسێك بنێرم بۆ دەرەوەی

ئەو شارانە کەسێك تاقەتی حەج کردنی هەبێ وە مانع بێ لە کردن جزیەیان لە سەر دابنێم چونکە ئەوانە موسڵمان نین ، وە هەروەها سعید کوڕی جبیر فەرمویە دراسێ یەکم هەبوو خاوەنی ماڵ و سەروەت بوو وەمرد حەجی نەکرد وە منیش نوێژم لە سەر نەکرد مانای وایە کە بەموسڵمانم نەژمارد، گێڕراویانەتەوە لە پێغمبەرەوە کە فەرمویەتی خوای گەورە ئاگادار ئەکاتەوە کە مەلائکەتان لە ڕۆژێك دا کە حاجی لە کێوی عەرەفات ڕائەوەستن ئە فەرموێ ئەی مەلائکەتینە تەماشای بەندەکان کەن ڕوویان تۆزاوی بووە وە خۆیان نارەحەت کردوە و ئەزیی یەتی لەشی خۆیان داوە وە ماڵی خۆیان سەرف کردوە لە ڕێ منا ئەوا ئێوە شاهد بن کە دوعای ئەوانم گیرا کرد وە خراپەکانم بە چاکەکان بەخشین وە ئەوانەی کە چاکن هەموو تکام بەجێ هێنان پێجگە لەو « حق الناس » ، کە لە بەینی خـۆیان دایە وەختێکی هاتنەوە لە میناوە بۆ (مزدلفە) ، خوا ئەفەرموێ وەکو پێشەوە وە هەروەها ئەوا ئەو حقوقەشم لە سەر لابردن ، یاربی خوایە خۆشبی لـە گوناهی گەورەو پچوکمان بۆ خاتری پێغمبەر «ص» آمین ،

گێڕراویانەتەوە لە یەکێك لە ئەولیاکان ئەفەرموێ سی و سێ جـار حەجم کرد جاری دوایی لە عەرفە وەستام ووتم خـوایە ئـەوا سی وسێ چارحەجم کرد جاری یە کەمیان لە باتی فەرزی خۆم دووەم بۆ باوکم بێ و جاری سێهەمین بۆ دایکم بێ وە ئەوانی کەش بۆ ئەو کەسانە بـێ کـە حەجیان لێ گیرا نەکراوە ، وەختێك لە عەرەفات هات بۆ مزدلفە لە خەوا پێ یان ووت تۆ بیرت وایە کە سەخاوەتی خۆت دەر بخەیت ، خوای گەورە ئەفەرموێ قەستەم بە گەورەیی خۆم خۆش بووم لەو کەسانەی کە لە

عەرەفە راوەستاون لە پێش ئەوەی کە کێوی عەرەفە دروست بکەم بە دوو هەزار ساڵ ، داوا ئەکەین لە خوا کە لـە گوناهی ئێمەش خۆش بێ بـە بەرەکەتی پێغمبەر «ص» •

## « ئەحکامی حەج »

پێ ویستە کە لە پێشدا نی‌یەت بێنی بڵێی احرامم دابەست یا بـە حەج یا بە عومرە بۆ خوا «الله اکبر» وە هـەروەها راوەستی لە کێـوی عەرەفە وە تەوافی ماڵی خوا «بیت الله» بکەی حەوت جار وە سەعی بکەی لە بەینی « صفاو مروەدا » حەوت جار لە صفاوە دەست پێ بکەی وە لـە مروە دوایی بێنی وە بێجگە لە راوەستان لە عەرەفە هەمویان ئەرکانن بـۆ عومرەش •

## « پی ویستەکانی (واجبەکانی) حەج »

پێ‌ویستی یەکانی حەج ئەوەیە کە ئەبێت نی‌یەتی احرام لە جێی دیاری کراو بێنێ وە شەو بمێنی تەوە لە مزدلفە ساتێك «لحظەیەك» لـە نیوەی دوایی لە شەوی جەژن وە هەورەها دیسان شەو بمێنیتەوە لە مینا لە سێ شەوی « ایام التشریق» دا وە لە هەموو رۆژەکانا حەوت بەرد بهاوێ بۆ جێی معلوم کراو وە تەوافی خوا حافیزی بکەی مەگەر خەڵکی «مکە بێ یا ژنی «حیض» داربێ ئەگەر یەکێك لە وانە نەکرا فدیەی لە سەر پێ ویست ئەبێ مەرجی تواف ئەوەیە ئەبێ دەست نوێژت هەبێ وە عەورەتت داپۆشرابێ ا لە راستی بەردی رەش « حجر الاسود» دەست پێ بکـەی

وه ماڵی خوا «بیت الله» لای چەپ بێت وه حەرامه له احـرام دا جماع کردن و تێکەڵی ژن به شهوەت و ماچ کردن و منی هێنانەوه وه نکاح کردن و خۆ بۆن خۆش کردنورۆن لەمووداں وه موو لابردن وه نینوك کردن وراوکردنو خواردنی گۆشتی ئاژەڵ «حیوان» به راو بۆی گیرا بێ و وه بەرگی درووراو له بەر کردن وه هەروەها حەرامه بۆ پیاو سەری داپۆشرێ وه بۆ ژن دەم وچاوی داپۆشرێ ئەگەر یەکێك له وانەی کرد ئەگەر بـه ئەڵەف دانه بێ ویسته فدیه بدا ، وه ئەگەر بۆ استراحەته فدیەی تێدا نی یه .

## « باسی گەورەیی مەکه »

خوا ئەفەرموێ «ان اول بیت وضع للناس للذی بمکة مبارکا وهدی للعالمین » مانای یەکەم خانویەك که دروست کراوه بۆ عالەم ئەو خانوەیه که ناوی مەکەیه خاوەنی بەرەکەت و باعسی هدایەته بۆ عالەم « ومن دخله کان آمنا » کەسێك بچێ بۆ ناو ئەو ماڵه به بیرێکی باش ئەمین ئەبێ لـه نارەحەتی دونیاو قیامەت ، به روایەتێك گێرراویانه تەوه که پێغەمبەر «ص» فەرمویه سوێند به خوا ئەی مەکه تۆ چاکترین زەوی خوای و خۆشەویست ترین زەوی خوای له لای من ئەگەر له بەر ئـەوه نەبوایه که خوا پێی مصلحەت بو که من له مکه بررۆم قەت نه ئەرویشتم ، وه به روایەتێکی که گێراویانەتەوه ئەڵێن که له سەر رووی زەوی شارێکی کەی وەها نی یه که یەك چاکەو خێری تێدا بکرێ خوای گەوره به سەد هەزاری بنوسێ بێجگه له شاری مەکەی پیرۆز نەبێ وه روایەت هەیه ئەڵێن هەرکەسێك

بێته ناو «بیت الله» نیشانەی ئەوەیە خوا ڕەحمی پێ کردوە وە ئەگەر ڕۆیشته دەرێ گوناهی پێ وە نامێنێ و تەماشا کردنی «کعبه» عبادەتە وە حەشری ئەو کەسە ئەکرێ لە گەڵ ئەو کەسانەی لە ئەمنین وە روایەت کراوە کە خوا حەشری هەفتا هەزار شەهید ئەکا لە گۆڕرسانی (مەکە) ئەچنە بەهەشت بەبێ حساب هەر یەکێکیان شفاعەت ئەکا بۆ هەفتا کەس ، عەرزی پێغمبەریان کرد ئەوانە کێن کەوا گەورەن فەرموی ئەو کەسانەن کە بە غەریبی لە مەکە مردوون وە کەسێك بمرێ لە مەکە یا لە مدینـە یـا لە بەینی مکەو مدینەدا بە شێوەی حەج کردن یا عومرە کردن خوا زیندوی ئەکاتەوە لە گەڵ ئەو کسانە کە ئەمنین لە عەزابی خوا ، وە کەسێك بخواتەوە لە ئاوی زەمزەم دوور ئەبێ لە منافقی ، یارەبی خـوا حسابمان بکەی لەو کەسانەی ئەمنین و دوورمان بکەی لە منافەقیو حشرمان بکەی گەڵ کۆمەڵێ شەهیدان و بمان خەیتە بە هەشتە وە بەبێ حساب آمین •

## باسی زیارەتی گوڕری پیغمبەر (ص) و گەورەیی مدینـە

پێغمبەر «ص» فەرمویە کەسێك حەجی کـرد لـە پاشان زیارەتی گۆڕری منی کرد وەکو زیارەتی منی کردبێ بە زیندویی وەهایە فەرمویە کەسێك زیارەتی گۆڕری من بکا واجب ئەبێ شفاعەتی من بۆ ئەو کەسە ، وەهـەرکـەس حـەج بکـا زیـارەتی مـن نەکـا ئـەوا ئـەو کـە سە ئەزیەتی مـن ئـەدا وە کـەسێك زیارەتی من بکا بە دڵێکی ساف و پاك شەفاعەتی بۆ ئەکەم لە ڕۆژی قیامەت دا و کەسێك پێی خۆشە کە من شفاعەتی بۆ بکەم لە مدینە بمرێ چونکە هەر کەسێك لە مدینە بمرێ من شفاعەتی بۆ ئەکەم کەوایێ پێ ویستە داوا

یکەمن کە بمان مرێنێ لە شاری رسول الله «ص» چونکە پیاوی سەغی سواڵکەر دەر ناکات لە دەرکی خۆی وە مەرحەمەتی لەگەڵ ئەکا .

## « باسی گەورەیی قورئان »

پێغمبەر « ص » فەرمویە گەورەیی قورئان بەسەر ووتەیەکی ئەوە وەکو گەورەیی خواوایە بەسەر عالەم دا وە فەرمویە کەسێك پیتێك لە قورئان بخوێنێ دە خێری بۆ ئەنوسرێ وە هەر خێرێك بە دەیەك دائەنرێ نالێم ألم پیتێکە بەلکو ئەلف پیتێکە و میم‌پیتێکە وە فەرمویە کەسیك سەد آیەت بخوێنێ بەبێ ئاگا ناژمێرێ . وە کەسێك قورئان بخوێنیوە ئیش بکا بەگوێرەی ئەو شتەی لە قورئان دا نوسراوە باوکی ئەو کەسە تاجی لەسەر ئەبێ لەرۆژی قیامەتدا چ جای ئەو کەسەی کە بۆ خۆی قورئان بخوێنێ وە پەیرەوی پێ بکا وە هەرکاتێك ئینسان قورئانی خەتم کرد شەست هەزارمە لائکەت دوعای بۆ ئەکا وە کەسێك بۆ خۆ قورئان نەخوێنی گوێ راگرێ بە هەر ئایەتێك چاکەی زیادی بۆ ئەنوسرێ وەکەسێك ئایەتێك بخوێنێ لە قورئان بۆی ئەبێتە نور لە رۆژی قیامەت وە کەسێك قورئان فێری کورری خۆی بکا لە قورئانداو بی زانی خوا خۆش ئەبێ لە گوناهی ئەو کەسە وە ئەگەر لەبەر فێری بکا هەر وەختێك ئەو کورره ئایەتێکی خوێند خوا دەرەجە بۆ باوکی ئەو کورره زیاد ئەکا تا دوا پلە ، وە کەسێك قورئان بزانێ هەروەك ئەوە وایە کە ئاڵای ئیسلامی پێیە ئەگەر ئیکرامی ئەو بگیرێ ئەوە احترامی خوایە وەئەگەر بێ احترامی پێ بکرێ لەعنەتی خوای لەسەرە ، پێغەمبەر «ص» فەرمویە بۆم ئاشکرا بوو خێراتی عالەمو خرابەی عالەم چاوم پێ نەکەت خراپ تر لەوە

کەسێك سورەتێك قورئان بزانێ لەپاشان لە بیر خۆی بکاتەوە ئەو کەسە ممکنەکە بە گولی بە خزمەت خوا بگات . ( ئیمام ی ئەحمەد ) فەرموویە بە خوا گەیشتم لە خەوم دا عەرزم کرد خوایە بە چ شتێك ئینسان لە تۆ نزیك ئەبێ فەرموی بەقورئان خویندن ، عەرزم کرد بە مانا زانینەوە یا نەزانینەوە فەرمووی مانای بزانی یا نەیزانی جیاوازی نی‌یە .

بە راستی قورئان خوێندن لە هەموو زیکرێکی گشتی باش ترە وە قورئان خوێندن بە تەماشاکردنو لە نوێژدا لە نیوەی دوایی شەودا و لە بەینی خۆر ئاوابونو خەوتناندا وە لە پاش نوێژی بەیانیانو لە گەورەترین کاتا گەورە ترە لە گشت وەخت و کاتێکی کەدا .

## « باسی گەورەیی صلوات »

### لە سەر پێغمبەر « ص »

خوا فەرمویە « یا ایها الذین آمنــوا صلوا علیه وسلموا تسلیما » مانای ئەی موسڵمانینە ئێوە صلوات لە سەر پێغمبەر بڵێن وە سەلامیشی لە سەر بڵێن بە چاکی ، وە هەروەها پێغەمبەر « ص » فەرمویە صلوات سەرمن بڵێن چونکە صلوات وتن لە سەر من باعسی مەحو بونەوەی من بڵێن چونکە صلوات وتن لە سەر من باعسی مەحــو بونـەوەی گوناهی ئێوەیە وە باعثی بڵند بوونەوەی پلەی ئێوەیە کەسێك صلواتێك لە سەر من بڵێ خوا دە رەحمەت بـۆوی ئەنێرێ . پێغمبەر « ص » فەرموویە مەلائکەتێك هات بۆ لای من ووتی : کـەسێك صلواتێك لـە سەر تۆ بڵێ خوا دە گوناهی لێ مەحو ئەکاتە وە وە خێری بۆ ئەنوسێ وە دە پلەی بۆ زیاد ئەکا وە هێندەی دوعا بۆ ئەکرێتەوە ، وە فەرمویە

کەسێك دە صلوات لە سەر من بلێ خوا سەد رەحمەتی بۆ ئەنێرێ و
کەسێك سەد رە حمەتی خوای بۆ هات لە بەینی هەردوو چاوی ئە
نوسرێ بەری بوون لە منافقی و بەری بوون لە دۆزەخ وە خوا ساکنی
ئەکا لە رۆژی قیامەت لە گەڵ جماعەتو کۆمەڵی شەهیدان ، وە پێغمبەر
فەرمویە سێ کەس لە ژێر سێبەری خوادان لە رۆژی قیامەت دا لە رۆژێك
دا سێبەر نی یە بۆ کەس بەس بۆ ئەو کەسە نەبێ کە خوا رەحمی پێ
بکا عەرزیان کرد ئەو سێ کەسە کێن فەرمووی یەکێکیان ئەوەیە کە
نارەحەتی لە سەر ئومەتی من لابەرێ وە یەکێکیان ئەوەیە دەستوری من
رەواج پێ بدا وە یەکێکی کەیان ئەو کەسەیەکە صلوات زۆر لە سەر من
بلێ ، کعب الاحبار فەرمویە خوا وەحی بۆ حەزرەتی موسی نارد پێت
خۆشە لە نارەحەتی رۆژی قیامەت رزگارت بێ فەرمووی خوایە بەلی
فەرمووی زۆر صلوات لەسەر ( محمد ) بلێ ، جارێك حەزرەتی عائشە
لە مالی خۆی بەرگی ئەدروو لە ئاخری شەودا دەرزی یەکەی لێ کەوت
چراش کوژابووەوە لەو کاتەدا پێغمبەر تەشریفی‌چۆژووری‌هەموی‌بەجاری
رووناك کرد حەزرەتی عایشە دەرزیەکەی دۆزی یەوەو فەرموێ قوربان
عجائب دونیات رووناك کرد زۆرشە خصێکی جوانی عجائب بۆجوانی تۆ
فەرمووی ناخۆشی بۆ کەسێك کە من نابینی عەرزی کردکێیە کە تۆ
نابینێ فەرمووی ئەو کەسە کە بەخیلە عەرزی کرد کێیە ئەو بەخیلە
فەرموی ئەو کەسە ناوی منی گوێ لێ یەو صلواتم لە سەر نالێ . لە راستی
دا صلوات زۆر ووتن لە گەڵ سەلام لە تەررەف خوا داوا کراوە «مطلوبە»
لە ئینسان لە نوێژدا بە واجبی وە لە دەری نوێژدا سوننەتەکەوا بێ‌بێ
ویستەرەغبە تت لە سەری بێ لە هەموو کاتێکدا ئەگەر صلواتێکی

گورتیش بێ مثلا وەکو « اللهم صل علی محمد وآله وسلم » وەگەورەیی صلوات هەر خوا ئەیزانێ چەندە وە کـەسێك بێ باك نەبێ لـە دین دا تەرکی صلوات ناکا .

بە روایەتێك وا گێرراویانەتەوە کە هەندێك پیاو چاك « ابو حفص » خوا رەحمی بێ کردم وە لێم خۆش بوو پێیان ووت بە هۆی چی یەوە یان لە خەودا چاو پێ کەوت پێ یان ووت خوا چی لە گەڵ کردی ووتی ووتی وەختێك رایان گرتم لە خزمەت خوا ئەمری کرد بە مەلائکەت گوناهی منیان حساب کرد وە صلوات و نوێژی منیان حساب کرد کە بۆیان دەر کەوت صلواتەکانم زۆرتر بوون لە گوناهەکان خـوا فەرموی ئەی مەلائکەتی من تازە حسابی لە گەڵ مەکەن بی بەن بۆ بە هـەشت . یاررەبی خوایە داخلی بەهەشتمان بکەی بەبێ حساب بۆ خاتری ئـەو خۆشە ویستەی خۆت کە « محمد المصطفی »ی هەڵبژێرراوە .

## باسی «هاوبەش پەیداکردنی چووك بوا خوا کە» ( ریـایە )

خوای گەورەو میهربان فەرمویە « فمن کان یرجو لقاء ربه فلیعمل عملا صالحا ولا یشرك بعبادة ربه احدا » مانای کەسێك ویستی و مەبەستی وابو کە بە پاکی بە خزمەت خوا بگات با کاری چاکە بکات کە بریتی یە لـە پەیرەوی کردنی دەستوری ئیسلامی وە هیچ هاو بەشی بۆ خوا پەیدا نەکا مانای بەو کارە مەبەستی مەقبولی پێش چاوی خەڵکی نەبێ بەڵکو مەبەستی پێ رەزا بوونی خوا بێ پێغمبەر «ص» ئەفەرموێ لە هەموو شتێ زیاتر کە لێی ئەترسم بە سەر ئێوەدابێ ریایی کردنە خوا ئەفەرموێ لە رۆژی قیامەت دا بەو کەسانە کە ریا باز بوون لەو کاتەدا کە خـوا

جەزای عالەم ئەداتەوە ، بڕوۆن بۆ لای ئەو کەسانە لەئەو ئیشەتان بۆ ئەکرد ، ئایا جەزایان پێ ئەدرێتەوە بۆ ئێوە ، پێغەمبەر «ص» فەرمویە : خوا حەرامی کردوە لە سەر کەسێك کە بە ریایی عیادەت بکا ، بە راستی بۆنی بەهەشت رێگای پێنج سەد ساڵ دەرروا بەڵام ئەو کەسەی کە بۆ دنیا عیادەت بکا ئەو بۆنەی دەست ناکەوێت مانای ناچێتە بەهەشت مادام لە سەر ئەو وەضعە بمرێ وە فەرمویە لە دۆزەخ دا جێگایەك هەیە ، دۆزەخ بۆ خۆی پەنا ئەگرێ بەخوا لەو جێیە رۆژی چوارسەد جار ساز کراوە ئەو جێگایە بۆ ئەو کەسانە کە رریا بازن لە ئومەتی پێغەمبەر « ص » وە بۆ ئەو کە سانەی کە قورئان بخوێنن بە ریایی وە بۆ ئەو کەسانەی کە صدقەو چاکە ئەکەن بە ریا یی وە بۆ ئەو کەسانەی کە حەج ئەکەن بە ریایی وە فەرمویە کەسێك نوێژ بە چاکی بکا کە عالەم چاوی لێ بێت وە بە خرابی بکا کە عالەم ئاگای لێ نەبێت ، ئەوە گاڵتە بە خوا ئەکات وە فەرمووی لە رۆژی قیامەت دا کاغەزی «عمل» ئامادە ئەکەین • خوا ئەفەرموێ بە مەلائکەتان کە هێنێك کاغەزان فرێ دەن وە هێندێکیان قبوڵ کەن ملائکە عەرزی ئەکەن ئەو کاغەزانە فرێیان ئەدەین کە غیری چاکە هیچی کەی تیادا نەنوسراوە ، خوا ئەفەرموێ بە راستی بە زاهری چاکەیە بەڵام من ئەزانم کە ئەو کارو ئیشە بە ریایی کراوە وە من کارێك گیرا ئەکەم کە بە تایبەتی بۆ رەزا بوونی من بێ وە فەرمویە یەکەم کەسێك کە خوا حسابی لە گەڵ ئەکا لە رۆژی قیامەت دا ئەو کەسەیە کەکوژراوە لە شەرری کافرانا ئەو کەسە ئامادە ئەکرێ خوا نعمەتی خۆی لێ حاڵی ئەکا وە ئەفەرموێ بەو نعمەتە چیت کرد وەلامی ئەداتەوە ئەڵێ قوربان لە رێی

تۆدا غەزام کرد هەتا شەهید کرام ئەفەرموێ درۆت کرد بۆیە شەررت کرد هەتا پێت بڵێن پیاوێکی ئازای ، وە ئەوەشت پێ ووتراوە جەزای خۆت لە دونیادا دەست کەوتوە ، رای کێشن بۆ دۆزەخ لە پاشان کەسێك ئەهێنن وە ئامادەی ئەکەن کە علم و قورئان فێر بووە وە خوا نیعمەتی خۆی لێ حالی ئەکا وە ئەفەرموێ ئەم نعمەتەت چۆن بە کار هێنا عەرزی ئەکا ئەڵێ رابەری ا ارشاد خەڵکیم و قورئانم ئەخوێندە بۆ بەرزی ئاینی ئیسلام وە ئەفەرموێ درۆ ئەکەی بۆیە وات ئەکرد هەتا پێت بڵێن قورئان خۆینی چاکە وە مەلای چاکە ئەوەشیان پێ ووتوی رای کێشن بۆ دۆزەخ ، لە پاشان کەسێك ئامادە ئەکەن کە خوا ماڵێکی زۆری پی بەخشیوە لە هەموو جۆرێك ئەو نیعمەتانەی لێ حالی ئەکا کە پێی ئەفەرموێ چیت بەو نیعمەتەی من کرد ؟ عەرزی ئەکا قوربان بەخشیوە ئەفەرموێ چیت بەو نیعمەتەی من کرد ؟ عەرزی ئەکا قوربان لە رێی تۆدا سەرفم کرد خوا ئەفەرموێ درۆت کرد بۆیە سەرفت کرد هەتا پێت بڵێن پیاوێکی سەغی یە ئەوەشیان پێ ووتوی بی بەن بۆ دۆزەخ •

پێغمبەر «ص» فەرمویە خوا ئەمر ئەفەرموێ بە عالەمێك بۆ بەهەشتیان بەرن هەتا نزیك ئەبن لە بەهەشت وە بۆنی بەهەشتیان بۆ دێ وە تەماشای کۆشکی بەهەشت ئەکەن وە ئەوەی خوا لە بەهەشت دا دروستی کرد وە لە پاشان ئەفەرموێ بیان گێرنەوە دواوە وە هیچ بەشیان لە بەهەشت دا نی یە وە ئەگەررێنەوە بە حەسرەت ئەوانیش ئەڵێن خوایە هەر لە ئەوەڵەوە بچوینایە بۆ دۆزەخ باشتربوو ئەوەك چاومان بە نیعمەتی بەهەشت بکەوتایە خواش ئەفەرموی منیش مەبەستم ئەوەبو حەسرەتتان زیاتر بێ چونکە ئێوەش لە دونیادا واتان ئەکرد لە بەر چاوی خەڵکی

حزمەتی ئیمەو ئەکرد بە زوونی بێ باکی‌و ئەکرد لە خەڵك ئەترسانە بەڵام لە من نەئەترسان «تعظیم» ی عالەمتان ئەکرد بەڵام « تعظیم » ی منتان نەئەکرد منیش ئەمرۆ ئازارتان ئەدەم وە هیچ جەزاتان نادەمێ ، پیاوێك پرسیاری لە پێغمبەر «ص» کرد ووتی بۆ رۆژی قیامەت ئینسان بەچی رزگاری ئەبێ فەرمویێ بەوە رزگاری ئەبێت کە فررو فێل لە گەڵ خوانەکەی ووتی : فرروفێل لە گە خوا ئەکرێ فەرموی بەو جۆرە ئەبێ کەئیش بەئیش خواو پێغمبەر «ص» بکەی وە مەبەستیش رەزابوونی خەلکی بێ •

## « ئاگادار کردنەوە »

بە راستی ریایی ئەوەیە کە مەبەست بکا ئینسان بەو کارو خوا پەرستی یە کە ئەیکا بێجگە لە ذاتی خوا بەڵکو مەبەستی یا ماڵ دەست کەوتن بێ یا مەدح کردنی خەڵك بێ بەڵام ئەگەر مەبەستی رەزا بوونی خواش بوو وە ئارەزووی دونیاش بوو ئەوە پێ ویستە کە چاودێری بکرێ ئەگەر تێ بینی دونیایەتی زیاتر بوو خێری نی‌یە وە ئەگەر تێ بینی قیامەتی بە هێزتر بوو خێری هەیە ئەگەر تێ بینی هەردوولای کرد وەك یەك نە خێری هەیە وە نە گوناه : یارەبی خوایە اخلاصمان بە هێز بکەی‌و یمان‌گیری لەو کەسانە کە بە مخلص عادەتی تۆ بەجێ ئەهێنن آمین یارب العالمین •

## « باسی به فیزی هەوایی »

خوا ئەفەرموێ : « تلك الدار الاخرة نجعلها للذين لايريدون في الارض علوا ولا فسادا» » مانای : ئێمە برریارمان داوە ئەو خانووەی قیامەتی کە برێتی یە لە بەهەشت بۆ ئەو کەسانە کە لە سەر زەوی نیازی فیزناکەن و خۆیان بە گەورە ناگرن بە سەر عالەمداو خەراپە نەکەن لە سەر زەوی تێفکرە تەنها بە نیازکردنی فیز خوا بەهەشتی لە ئینسان قەدەغە « منع » کردووە چ جایی ئەوەی کە بیکەی پێغمبەر « ص » فەرمویەتی ناچێتە بەهەشت کەسێك کە هێندەی هەرەووردیلە یەك فیزی هەبێ وە ناچێتە جەهەنەم کەسێك کە هێندی هەرە وردیلەیەکی « ذەرە » برروایی « ایمان » لە دڵ دا هەبێ مانای برروایی و فیز بە یەکەوە کۆنابنەوە وە فەرمویەتی خۆتان دوورخەنەوە لە فیز چونکە بە واستەی فیز شەیتان

تەوقی لەعنەتی لە گەردن کرا وە خۆتان دوورکەن لە تەماعی زیاد چونکە حەزرەتی ئادەم بە واستەی تەماعی زۆر لە بەهەشت هاتە دەرەوە وە خۆتان دوورخەن لە « حسودی » چونکە بە واستەی حسودی کورری حەزرەتی ئادەم « قەتلی » کرد کەوابوو فیز « تكبر » بناغەی هەمو گوناهێکە وە پێغمبەر « ص » فەرمویەتی کەسێك لە بەرفیز خەڵك لە بەر دەستی راوەستی با جێگەی خۆی لە دۆزەخ ئامادە بکا وە فەرمویەتی کەسێك پێ یەوی تەماشای شەخسی دۆزەخی بکا با تەماشای ئەو کەسانە بکا کە خەڵك لە بەر دەستیان راوەستاوە لە بەر فیز ، جارێکی حەزرەتی «سلێمان» ئەمری فەرمو بە ئەجنەو ئینسان و باڵندە کۆبنەوە لە هەمویان دووسەد هەزار کۆبوونەوە حەزرەتی سلێمانیان بەرزکرد بۆ ئاسمان هەتاکو

گوێی لە تسبیحاتی مەلائکەتان بو لە ئاسمان لە پاشان هاتەوە خـوارێ هەتا لاقی کەوتە سەر بەحر گوێی لە دەنگێك بو دەی گوت ئەگەر لە دلێ سلێماندا بە قەدەر وردیلەیەك «مثقالە ذەررەیەك» فیز هەبایە بە زەویم دا دەبردە خوار بە ئەندازەی ئەوەی کە بەرز بوەوە پرسیار کرا لـە حەزرەتی سلێمان چ گوناهێکە کە کردار سوودێ نادا لە گەلّ ئەو گوناهە فەرموی ئەو گوناهە فیزە •

## «باسی زەممی فیزو گەورەیی خو بەکەم گرتن»
## « تواضع »

پێغمبەر «ص» فەرمویەتی لە زەمانی پێشودا شەخصێك بوە بەرگی خۆی دریژ کردوە لە بەر فیز رۆیشتوتە خوارێ بە زەویدا تێستاش بـە زەویدا ئەرروات‌ە خوار هەتاکو رۆژی قیامەت وە فـەرمویەتی کـەسێك نەفسی خۆی بێ گەورە بێ و دە رۆیشتن دا فیز بکا بە خذمەت خـوای ئەگا خواش رقی لێیەتی عەرزی پێغمبەریان کرد ئینسـان پێی خۆ شە بەرگی جوان بێ ئایا ئەوە بە فیز ئەژمێررێ ! فەرموی ئـەوە زەرەری نی‌یە چونکە خوا جوانی خۆش ئەوێ وە فەرمویەتی خۆ بەکەم گـرتن هەر گەورەیی پەیدا ئەکا جا ێوە خۆ بە کەم بگرن تاکـو خـوا پایەتان بەرز بکا وە لێ خۆش بوون « عفو » گەورەیی پەیدا ئەکا لە یـەك تـر بورن تاکو گەورەیی تان دەست کەوێ وە چاکە کردن « صدقە » هەر مالّ زۆر ئەکا چاکە بکەن تاکو خوا بەزەیی پێدابێن وە پێغمبەر « ص » فەرمویەتی کەسێك بەرگی ناشیرین دە بەر بکا لە بەر خۆ بە کەم گرتن نەك لە بەر رەزیلی وە توانای هەبێ بەرگـی جـوان دروست بکا بانگ

ئەکرێ لە رۆژی قیامەت لە پێش چاوی هەموو خەڵك وە سەر بـە خـۆ ئەکرێ لە هەر بەرگێکی جوان لە بەرگی بەهەشت دە بەر بکا وە فەرمویەتی کەسێك لە هەوەڵەوە سەلامی کرد ئەو کەسە دوورە لە فیزو فەرمویەتی ئێوە خۆ بە کەم بگرن و برایەتیە پیاوی هەزار بکەن تاکو دوور بن لە فیز وە بە خۆ بە کەم گرتن ئەزمێررێ دانیشتن لە خوارەوەی مەجلیس خوایە بەشمان دەی خۆ بەکەم گرتن امین •

## « باسی حسودی »

حوای تەبارەك وە وتعالا لە زەمی حەسودی بردن بە خەڵك بە پێغەمبەری «ص» فەرموە « ام یحسدون الناس علی ما آتاهم من فضله » مانای ئێـوە حەسودی ئەبەن بە پێغمبەر «ص» لە سەر ئەوە کـە خـوا کردویەتی بە پێغمبەر «ص» فەرمویەتی حەسودی چاکەی ئینسان ئەشواتەوە وەکو ئاور دار ئەسوتێنێ وە حەسودی ئیمان لا ئەبا وەکو تاڵ شیرنایەتی هەنگوین لا ئەبا وە فەرمویەتی لە اومەتی من نازمیرێ ئەو کەسەی حسود بی یا قسەی خەڵك بە خەراپی بگێررێتەوەوەفەرمویەتی بڵاو بۆتەوە لە ناو ئێوەدا ئەو نەخوشیانەی کە لە ناو اومەتی پێشودا بون وەکو حسودی و ڕق بێ کە دینی ئینسـان لا ئەبەن سوێندم بەو کەسەی کـــە نەفســـی محمـــدی بـــە دەستـــە ناچنـــە بەهەشتێ هەتاکو ئیمان نەیەنن و ئیمان و نابێ تاکو خۆشەویستی یەك ترتان نەبێ ئاگارتان ئەکەم بە شتێك ئەگەر بە جێی بێنن یەك ترتان خۆش ئەوێ فەرموی سەلام زۆر لە یەك تر بکەن یەك ترتان خۆش ئەوێ وە فەرمویەتی خوا تەماشای کردوەی ئینسان ئەکا لە شەوی نیوەی مانگی « شعبان » خـۆش ئەبێ لەو کەسانەی کە داوای لێ خۆش بوون ئەکەن وە ڕوحم بەو کەسانە

ئەکا کە داوای روحمی لێ ئەکەن بەڵام ئەو کەسانە کە ئەهلی حـەمادەتن دوایان ئەخا هەتاکو پەشیمان ئەبنەوە •

## « باسی رق هەستان »

پێغمبەر «ص» فەرمویەتی ئەی «معاویە» خۆت دوور خەوە لە ررق چونکە رق ئیمان خەرا ئەکا هەر وەکو تاڵ شیرینی خەرا ئەکا وە هەم خـوا فەرمویەتی ئەی بەنی ئادەم تۆ منت لە یاد بێ کە رقت هەستا منیش ئاگاداری تۆ ئەکەم کە رقم هەستا وە غەزەبت لێ ناگرم لە گەڵ ئەو کەسانەی کـە غەزبیان لێ ئەگرم وە پێغمبەر «ص» فەرمویەتی بۆ دۆزەخ دەرکەیەك هەیە بۆ ئەو کەسەی ئەبێ کە بە ئارەزوی رقی کردەوە ئەکا وەکەسێـك رقی خۆی بخواتەوە لە عەزابی دۆزەخ دوور ئەبێ وە فەرمویەتی رق هەستان لە لایەن شەیتانەوەیە شەیتانیش دروست کراوە لە ئاگر ئاگریش ئەکوژێتەوە بە ئاو کەوابێ ئەگەر رقتان هەڵسا دەست نوێژ هەڵ بگرن وە فەرمویەتی ئینسان کە رقی هەڵسا « اعوذ باللّه من الشیطان الرجیم » بخوێنێ رقی نامێنێ •

## « باسی رق خواردنەوەو لی بوردن »

پێغمبەر « ص » فەرمویەتی کەسێك رقی هەڵساو رقەکەی خواردەوە و تواناشی هەبووو بە جێی پێنێ ئەو کەسە خوا دڵی پرر ئەکا لە ئەمی نیو ئیمان وە خوا خۆشەویستیئەو کەسەیهەیە کە رقی هەڵئەستێ لە باشان خۆ رائەگرێ وە فەرمویەتی لە هەمو شتێك جوانتر خۆگرتن « صبر » لە گەڵ زانین وە بە نەزانی کەس گەورە نابێ وە بە خۆگرتن « صبر » کەس زەلیل نابێ وە بە زەکات دان قەت ماڵ کەم ناکا فەرمویەتی خەبەرتان ئەدەمێ بە

کەسێك کە ئاوزی دۆزەخ لە سەروی حەرامە عەرزمان کرد بەڵێ « یا رسول الله »فەرموی حەرامە دۆزەخ لە سەر کەسێك کە خووی خۆ گرتن «صبر» بێ پیاو بە سەبر گەورەیە لە دونیادا گەورەیە لە قیامەتدا وە نزیکە ئینسان بە سەبر پێغمبەر بێ بەڵام هیچ پێغەمبەری کە نابن پاش • پێغمبەر « ص » •

# « باسی غەیبەت کردن »

خوا فەرمویەتی « یا أیها الذین آمنوا اجتنبوا کثیرا من الظن ان بعض الظن اثم ولا تجسسوا ولا یغتب بعضکم بعضا أیحب احدکم ان یأکل لحم أخیه میتا فکرهتموه واتقوا الله ان الله تواب رحیم » مانای ئەی ئەو کەسانەی کە برِرواتان بە خوا و پێغمبەر هەیە خۆتان بپارێزن لە زۆر فکری خەراپ چونکە هەندێك فکرهەن کە دەرحەقی یەکتر گوناهن وە لە سەریەك تـر جاسوسی خەراپی مەکەن و عەیبی خۆتان وون کەن و غەی بەتی یەك تـر مەکەن ئایا پێتان خۆشە کە ئێوە گۆشتی برای خۆتان بخۆن بە کاڵـی مانای غەیبەت کردن لە رێزی ئەوەیە کە گۆشتی برای خۆت بە کاڵی بخۆی وە پێویستە خۆتان بپارێزن لەو شتانەی کە خوا پێی ناخۆشن وە خوایەکی ئەوەندە گەورەیە کە تۆبە قەبوڵ ئەکا وە خاوەنی روحمە لە گەڵ خەڵك پێغمبەر «ص» فەرمویەتی خۆتان دوورخەنەوە لە غەیبەت چونکە غـەیبەت کـردن خـەراپ ترە لـە زینا لە بەر ئەوە کـە غەیبـەتت کـردو ئـەو غەیبەتە گەیشتەوە بەو کەسەی کە غەیبەتی کراوە هەتاکو گەردنت ئازاد نەکا رزگار نابی بەڵام وا هەیە زنا ئەکەیو پەشیمان ئەبیەوە رزگار ئەبی پێویستی بە هیچی تر ناکا جارێکی فەرموی ئەزانن چی لە سووت خەراپ

تره عەرزیان کرد بۆ خۆت باشتر ئەزانی فەرموی ئەوەیەکە بە حەلال بزانی حەیا بردن‌و ئەتك کردنی موسڵمان لە پاشان ئەو ئایەتەی خوێندەوە « والذین یؤذون المؤمنین والمؤمنات بغیر ما اکتسبوا فقد احتملوا بهتانا واثما مبینا » فەرموی ئەزانن غەیبەت چیە عەرزیان کرد بۆ خۆت باشتر ئەزانی فەرموی غەیبەت ئەوەیە باسی موسڵمان بکەی بە جۆرێکی وەها کە پێی ناخۆشبێ عەرزیان کرد ئەگەر ئەو چۆنیەتیە « صفه » تە لەو موسڵمانەدا هەبێ فەرموی ئەگەر هەبێ ئەوە غەیبەتە وە ئەگەر نەبێ ئەبێ تە بوختان حەزرەتی عائشە فەرمویەتی جارێکی باسی « صفیەم » ئەکرد لە خزمەت پێغمبەر «ص» فەرموی قسەیەکت کرد ئەگەر تێکەڵی ئاوی بەحری بکەی بۆگەنی ئەکا وە فەرموی کەسێك لەدونیاداغەیبەتی موسڵمان بکا لە رۆژی قیامە تدا گۆشتی ئەو موسڵمانەی لە پێش دائەنرێ زۆری لێ ئەکرێ کە بیخوا ئە وجا بە زەلیلی ئەی خوا وەکەسێك غەیبەتی کەسێکی لە لا بکرێ بێ باکی لێ بکا خوا زەلیلی ئەکا لە دونیاو قیامەتا «جابر» ئەفەرموێ جارێکی لە خزمەت پێغمبەر بووم بۆنێکی ناخۆش هات فەرموی ئەوە بۆنی غەیبەتی ئەوکەسانەیە کە غەیبەت ئەکەن فەرموی لەو شەوەدا کە بۆ معراج چووم تەماشام کرد قەومێك لاشەی مرداریان ئەخوارد گوتم ئەی « جبرەئیل » ئەوانە کێن فەرموی ئەو کەسانەن کە لەدونیادا غەیبەتی یەك تریان کردوە « عەبداللەی ئیمامی عباس » ئەفەرموێ ئەگەر نیازت وابو عەیبی موسڵمان بڵێی عەیبی خۆت وە بیر خۆت بێنەوە وە گوتراوە بەندە ئامادە ئەکرێ لە رۆژی قیامەتا کاغەزی کردەوەکانی ئەدەنێ تەماشای ئەکا هیچ چاکەی خۆی نابینێ ئەڵێ کوا نوێژم کوا رۆژووم پێی ئەڵێن هیچ کردەوەت نەماوە بە واستەی غەیبەت کردنی خەڵك •

## « باسی قسەگیر رانەوە بە خەراپە (نمامی) »

خوا فەرمویەتی « ولا تطع کل حلاف مهین هماز مشاء بنمیم » مانای ئەی محمد تۆ بــە ئارەزوی کەسێك ئیش مەکەکە سوێند خۆرە بە درۆ وخۆشەویست نی یە لە پێش چاوی خەڵك قسەی بە درۆ ئەگێرێتەوە بۆ خەڵك و قسەی خــەراپ دێنێ و ئــەی با بــۆ ناو خــەڵك پێغمبــەر «ص» فەرموویەتی ناچێ تە بەهەشتێ شەخسێك نمامی بکا وە فەرمویەتی باشتریبی اومەتی من ئەاونەن کە چاوت پێ کەوتن خوا وە بیر کەی وە خەراپ ترینی اومەتی من ئەو کەسانەن کە نەمامی ئەکەن و ئاژاوە ئەخەنە ناو خەڵك فەرموی خەبەرتان ئەدەمێ بەو کەسەی کە باشترە لەو کەسانەی کە نوێژو رۆژوو ئەگرن عەرزیان کرد بەڵێ فەرموی رێك و پێك کردنی ناو حەڵك چونکە خە رابی ناو خەڵك دینی ئینسان مەحو ئەکاتەوە اتفاقی اومەت هەیە لە سەر ئەوە کە حەرامە نەمامی وە گەورەترین گوناهە لە خدمەت خوا نەمامی بری تیە لە وە کە قسەی کەسێك بۆ کەسێك بەری لە سەر روی خەراپە بەڵام بردنی قسە بۆ چاکەو ئامۆژگاری ئەوە پێویستە (واجب) ە وە گوناه نی یە وە پێغمبەر «ص» فەرمویەتی کەسێك خاوەنی دوو زمانی بێ مانای نەمامی بکا خوا دروست ئەکا بۆ ئەو لە رۆژی قیامەتدا دوو زمانان لە ئاگر « ئیمامی غەزالی » فەرمویەتی خاوەنی دوو زمان ئەوەیە هاتوچۆ ئەکا لە مابەینی دوو دوژمندا وە لەگەڵ هەمویان قسە موافقی خووی ئەوئەکا وە کەمە کەسێك وەها نەبێ ئەوەش عەینی « منافق » یە پێویستە پەنا بەرین بە خوای خلاق •

# « باسی درۆ کردن »

خوا فەرمویەتی « الا لعنة الله علی الکاذبین » مانای ئاگاداربن لەعنەتی خوا هەیە لە سەر ئەوانەی کە درۆزنن زاهری ئایەت ئەوەیە چ کافـر چ موسلمان بێ مانای لەعنەت دور بوونە لە رەحمەتی خوا بەلام لە هـەموو۔ درۆیان خەراپ‌تر ئەوەیە کە درۆ هەلبەستی لە سەر پێغمبەر «ص» چونکە فەرمویەتی کەسێك درۆ بە زمانی منەوە هەلبەستێ با جێی خـۆی ئامادە بکا لە دۆزەخدا پێغمبەر «ص» فەرمویەتی لە سەر خۆتان بە پیویست بزانن راستی گوتن چونکە راستی ئینسان شارەزا ئەکـا بـۆ کـرداری باش وە کرداری باش ئینسان شارەزا ئەکا بۆ بەهەشت کەوابو راستی ئینسان شارەزا ئەکا بۆ بەهەشت کەوابو راستی ئینسان کە هەر راست گۆ بو وە بەردەوام بو لە سەرراستی ئەنوسرێ‌لە خذمەت خوا بە دۆستی‌خوا وە فەرمویەخۆتان دوور بخەنەوە لە درۆکردن چونکە درۆکردن ئینسان شارەزا ئەکـا بـۆ کردەوەی خـەراپ وە کردەوەی خـەراپ ئینسان شارەزا ئەکا بۆ دۆزەخ کەوابو درۆکردن ئینسان شارەزا ئەکا بۆ دۆزەخ وە ئینسان کە دەوامی کرد لە سەر درۆکردن ئەنوسرێ لە خذمەت خوا بە زۆر درۆزن « کذاب » وە فەرمویەتی چوار سفەت هەن کە ئینسان هەرچواری هەبن « منافقی » تەواوە ئەگەر بە تەواوی نەبن « منافقی » تەواو نی‌یە ئەگەر هیچی لەو سفەتانـە نەبن هیچ«منافقی»نی‌یە یەکی کیان ئەوەیە ئەگەرقسە ئەکا درۆ ئەکا وە ئەگەر پەیمان«وەعدە»ی دا بەجێی‌ناهێنێ‌وە ئەگەر رێك کەوت غەدرئەکاوە ئەگەر دوژمنایەتی کرد زۆر بێ دینی ئەکا وە فەرمویەتی درۆ کردن لەگەل ئیمان لێك دورن وە لە کاتی درۆ کردندا مەلائکەت لە بۆگەنی زاری دور ئەکەونەوە وە یەکێك لە درۆیان‌ئەوەیەهەرچی گوێت لێ بو بی گێریەوە وە

عەزابی توند هەیە بۆ ئەو کەسە درۆ بۆ خەڵك ئەکا هەتاکو پێی پێ بکەن وە کەسێك درۆ بکا لە خەون گێرانەوەدا داوای لێ ئەکرێ لە رۆژی قیامەتا گرێ وە دو دەنکە جۆیان بدا وە ئەگەر بە منداڵێ بڵێ وەرە شتێ کت ئەدەمێ ئەوەش بە درۆ ئەژمێرەرێ وە دەستوری پێغمبەر « ص » ئەوە بوە کەسێك درۆزن بوو بێ قسەی لە گەڵدا نەکردوە هەتاکو زانیویەتی کە تۆبەی کردوە ، درۆ کردنی گوناه بریتی‌یە لەوە کە قسە بکەی و کەچی واش نەبێ وە بە کەیفی خۆت قسە بکەی و بشزانی کە وا نی‌یە نزانرێ درۆ کردن « حەرامی » هەیە و « واجبی » هەیەو « دروست بونی هەیە » دەستوری ئەوەیە هەر حەقێکی بە درۆ وە بەراستی وە دەست ئەکەوت درۆ کردن حەرامە ، وە ئەگەر حەقی خۆت بە درۆ دەست ئەکەوت ئەوە دروستە وە ئەگەر ماڵی غەدر لێ کراوێك بەدرۆی تۆ رزگار ئەبوو یا خۆی بە غەدر حەبس « بەند » کرابو یاخەریك بون بە غەدر بەندی بکەن یا لێی بدەن درۆ کردن بۆ رزگار کردنی ئەو کەسە پێویست «واجبە».

## « باسی ئەمر کردن (فەرمان) بە چاکە و نەهی »<br>کردن لە خەراپە یە

خوای گەورە لە قرآندا فەرمویەتی ( والمؤمنون والمؤمنات بعضهم اولياء بعض يأمرون بالمعروف وينهو عن المنكر ) مانای پیاوی موسڵمان وژنی موسڵمان هەندێکیان گەورەن بە سەر هەندێکیاندا بە واستەی ئەوەی کە فەرمان ئەکەن بە یەك تر بە چاکە و قەدەغە « نەهی » ئەکەن لە خەراپە ( ئیمامی غەزالی ) فەرمویەتی ئەو ئایەتە وا دەر ئەخا کەسێك فەرمان ئەکا بە چاکە و رێ گری نەکا لە خەراپە بە موسڵمان ناژمێرەرێ مانای ئیسلامی

ساغ . پێغمبەر «ص» فەرمویەتی کەسێك چاوی بە شتێکی بێ شەرعی کەوت ئەبێ بی گۆررێ ئەگەر دەستی نەبوو بە زمان ئەگەر بە زمانیش رێی نەبو پێویست ( واجبە ) بە دڵی پێی ناخۆش بێ ئەوەش ئیمانی کزە، وە فەرمویەتی برروایی ( ئیمان ) هەشت بەشە شادە گوتن بەشێکە نوێژ کردن بەشێکە رۆژوو گرتن بەشێکە حەج کردن بەشێکە فەرمان بەچاکە بەشێکە وە رێ گرتنی خەراپە بەشێکە لە زەرەردایە کەسێك هیچ بەشی نەبێ وە فەرمویەتی « لا اله الا الله » گوتن سوودی زۆرە بۆ ئەو کەسەی کە ئەی لێ وە ناخۆشی و عەزابی لە سەر نابێ بە مەرجێك بێ پاکی نەکا بە مافی ئەو ووشە عەرزیان کرد مافی ئەو ووشە چی یە لە سەر ئینسان فەرموی بە ئاشکرا بێ ئەمری خوا ئەکرێ بەر بەرەکانی ناکرێ و ناگۆررێ بە داخەوە ئیستا کە رەواجی بێ فەرمانی خوا ئەکرێ کەوابو مەرجی سوودی ئەو ووشە پیرۆزە بۆ ئیمە زۆر دوورە هەتاکو خۆم ئاگادارم ئینسان ( لا اله الا الله ) ی ووتوە لێی پرسیوم دروستە بە خەڵك بڵێم نوێژ بکە کەوابوو ( انا لله وانا الیه راجعون ) بۆ ئەو ئسلامەتیە ، وە پێغمبەر « ص » فەرمویەتی فەرمان بکەن بە یەك تر بەچاکە وەگیررن یەك تر لە خەراپە لە پێش ئەوەی دا کە ئەپاررێنەوە لێ و وەر ناگیرێ وە لە پێش ئەو زەمانەدا کە داوای لێ خۆش بون ئەکەن و لێ خۆش بوون نی یە چونکە فەرمان بە چاکەو رێ گرتن لە خەراپە رۆزی لە ئینسان دوور ناخاتەوە وە مردنی لێ نزیك ناکاتەوە تەماشا ناکەن وەختێکی زانایانی جوولەکەو ئەرمەنی تەرکیان کرد فەرمان بە چاکەو رێ گرتن لە خەراپە خوا دووری خستنەوە لە رەحمەتی خۆی بە ( وەحی ) بۆ پێغمبەران ناردن لە پاشان تووشی بەلاو ناخۆشی زۆر بون ، وە فەرمویەتی شەخسێ هەیە لە رۆژی قیامەتدا ئەچێتە ملی

شەخسێکی تر بێ‌ی ئەڵێ بۆ وا لە من ئەکەی خۆ من تۆ نا ناسم ئەڵێ ئەوە پاداشی ئەویە کە منت چاو پێ‌کەوت لە سەر خەراپەو نەت‌گێرامەوە وە فەرمویەتی شەخس هەیە لە رۆژی قیامەتدا ئەی خەنە ناو دۆزەخ هەڵ ئەسورێ لە دۆزەخدا وەکو گوێ دریژ وە خەڵکی دۆزەخی لە سەر کۆ ئەبێتەوە وە ئەڵێن ئەی فلان کەس ئەتۆ بۆ چی وای ئەتۆ فەرمانت بە ئێمە ئەکرد بە چاکەو ئێمەت ئەگێڕراوە لە خەراپە ئەڵێ بە راستی وابوو بەلام ئەمن کردەوەم بە قسەی خۆم نە ئەکرد بۆیە تووشی ئەو عەزابە بووم وە فەرموویەتی خوای گەورە « وەحی » بۆ « جوبرەئیل » نارد کە فلان شار برروخێنە بە سەر مللەتەکەدا عەرزی کرد قوربان لە شارەکەدا عەبدێك هەیە یەك‌کات لە فەرمانبەری بێ ئاگا نەبوە فەرموی بە سەرویش دا بێ روخێنە چونکە جارێکی بۆخاتری من ئامۆژگاری موسڵمانی نەکردوە •

## « باسی ئیش کردن »

پێغەمبەر = ص = فەرمویەتی چاکترین ئیش سەودای بێ فێڵە وە ئیش‌کردنی ئینسانەی بە دەستی خۆی ، وە فەرمویەتی پاك ترین ئیش ئیشی بازرگانی یە بەلام ئەو بازرگانانەی کە لە قسە کردنا درۆ ناکەن وە لە ئەمانەتا فێڵ ناکەن وە لە پەیماندا بە پێچەوانە ناجوڵێنەوە وە ئەگەر شتیان کرری زەمی ناکەن وە ئەگەر شتیان فرۆشت فێڵی تێدا ناکەن وە ئەگەر قەرزدار بوون لە کاتی خۆی دوا ناخەن وە ئەگەر حەقیان لە سەر خەڵك بوو ئەزیەتی نادەن وە فەرمویەتی بازرگانی ئەمین و راست‌گۆ کە موسڵمان بێ لە گەڵ شەهیدان حەشری ئەکرێ وە فەرمویەتی نۆبەشی رۆزی لە بازرگانی دایەو بەشێکی لە زیندەوەر دایە ، جارێکی پێغەمبەر «ص» فەرموی

ئەی کۆمەڵی بازرگانان ئاگاداربن بازرگانان زیندو ئەکرێتەوە بەبێ دین تەنها ئەو بازرگانانە نەبێ کە لە خوا ئەترسن و چاکە ئەکەن و راست گۆن ، وە فەرمویەتی کەسێك رۆژی تەواو کرد تێوارە لە کرداری دەستی خۆی بخوا خوا لێی خۆش ئەبێ ، وە فەرمویەتی هیچ خواردەمەنی یەك حەلال تر نی یە لەو خواردەمەنی یەی ئینسان بە دەستی خۆی پەیدای ئەکات تەماشا ناکەن حەزرەتی ( موسی ) هەشت ساڵ یا دە ساڵ کرێکاری کرد هەتاکو خۆی بپارێزی لە گوناه ، وە فەرمویەتی کردەوەی باش بو پیاوان بەرگ درونە = خەیاتی = وەکردەوەی باش بۆ ژنان تەشی رستنە وە هەرکاتێك خوا لە ئیشێکدا رۆزیت فراوان کردن لەو ئیشە وازی لێ مەیەنن مانای ئەگەر لە ئیشێکدا رۆزیت فراوان نەبوو روو لە ئیشێکی تر بکە گەورەترین ی ئیشان بازرگانی یە هەندێ زانایان فەرمویانە = زەراعەت = کشتوکاڵە لە لە دوایی پیشە سازی لە دوایی بازرگانی روکنی سەودا ئەوەیە دووکەسی پێویستە سەودا کە بکەن وە ئەو شتە پێویستە کە سەودا ئەکرێ وە هەردوکیان قسەی وا بکەن کە رەزامەندی بگەیەنێ وە هیچ نەکەوێتە ناو قسەی ئەوان •

## « باسی سووت خواردن »

خوای تبارەك وتعالا فەرمویەتی « الذین یأکلون الربا لایقومون الا کما یقوم الذی یتخطبه الشیطان من المس » مانای ئەو کەسانە کە سووت خۆرن و تۆبەیان لێ نەکردوە زیندو ئەکرێنەوە لە رۆژی قیامە تدا بە شکلی شتێکی کە شەیتان دەستی لێ وەشاندبێ و شێت بووبێ وە دووبارە خوا فەرمویەتی « یا ایها الذین آمنوا اتقوا الله وذر واما بقی

من الربا ان كنتم مؤمنين فأن لم تفعلوا فأذنوا بحرب من الله ورسوله»
ماناى ئەى ئەوكەسانەى كە باوەررتان بەخواو پێغمبەر هەیە خۆتان بپا
رێزن لە سووت خواردن و تەرك بكەن ئەو سووتەى كە ماوەتەوە لە
سەر خەڵك ئەگەر خۆتان بە موسڵمان ئەزمێرن ، ئەگەر وازنەیەنن
ئاگادار بن بۆ شەرركردن لە گەڵ خواو پێغمبەر لە دونیاو قیامەتدا بەلام
عەزاب لە دونیادا بەو جۆرە پێویستە لە سەر ئەوكەسانە كە بەسەر
شەریعەت رائەگەن و فەرمانداری شەرعین و پێیان ئەكرێ ئەگەر
زانی‌یان كەسێك سووت خۆرە حەبسی بكەن هەر سەزا دانێك بە
لایقیان زانی بی كەن هەتاكو ئەو كەسە تۆبەى ئەكا وە ئەگەر ئەو
سووت خۆرە خاوەنی دەسەڵات بێ پێویستە تەرتیبی لەشكری بۆ
بكرێ وە بە زۆر « مەنع » بكرێ هەر وەكو حەزرەتی ئەبوبەكر كە
شەرری كرد لە گەڵ ئەوكەسانەى كە مانعی زەكات بون ، بەلام
عەزابی قیامەتی خوا نەبێ كەس نازانێ كە چۆنە الا خوا نەبێ كە
تۆڵەى خەڵك ئەستێنێ ، پێغمبەر «ص» فەرمویەتی خۆتان بپارێزن لەو
گوناهانە كە ئینسان بە هیلاك ئەبەن عەرزیان كرد « یارسول الله »
ئەو گوناهانە چن فەرموی یەكیان كافر بوونەو یەكیان سیحر كردنەو
یەكیان كوشتنی نەفسێكی بە ناحەقە و یەكیان خواردنی سووت و
خواردنی ماڵی هەتیوە و هەلاتن لە سەفی غەزایە بەو مەرجەى نیو
هێندەى كافران یا زیاد تر بن بەلام ئەگەر كەم‌تر بن لە ناو كافراندا
«حەرام» نی‌یە هەلاتن وە یەكیان ئەوەیە بە شەخسێكی بلێی زینات
كردوەو اسبات نەبێ ، وە فەرمویەتی خۆتان دوور بكەن لەو گوناهەى
كە خوا لێی خۆش نابێ بە بێ تۆبە یەكیان قێڵ كردنە لە تالاندا و

یەکیان سووت خواردنە کەسێك سووت بخوا زیندو ئەکرێ تەوە
بە شێتی لە پاشان ئەو ئایەتەی نوسراوی خوێندەوە وە فەرمویەتی
کەسێك سووت خۆر بێ پاداشی چاکەی نی‌یە و دووبارە خێری
«حەجی» شی نی‌یە وە کەسێك سووتی خوارد پێی ئەووترێ تۆبەی
بکەن ئەگەر تۆبەی کرد ئەوە باشە وە ئەگەر تۆبەی نەکرد لە
ئەستۆی ئەدرێ و ئەکوژرێ • وە پێغمبەر «ص» لەعنەتی کردوە
لەو کەسەی سووڵی ئەخوا یا وەکیلی ئەگرێ یا ئەی نوسێ یا شاهدی
بۆ ئەدرێ وە پێویستە بزانرێ کەسێك سووت بخوا حەرامە
بو کەسێك بە حەلاڵی بزانێ پێی کافر ئەبێ ، وە دووبارە پێویستە
بزانرێ قەدەغەکردنی خواردە مەنی لە موسڵمانان هەتاکو گران
ئەبێ حەرامە پێغمبەر «ص» فەرمویەتی کەسێك «مەنع» بکا تەعام لە
خەڵك هەتا گران ئەبێ ئەو کەسە گوناه بار ئەبێ وە ذمەی خواو
پێغمبر لەو کەسە دوورە وە فەرمویەتی کەسێك «مەنع» بکا «تەعام» لە
سەر اومەتی من چل رۆژ ئەگەر بی شی بەخشی خێری ناگاتێ وە
خەراپ ترینی «عەبد» ئەوەیە ئەگەر «تەعام» هەرزان ئەبێ پێی
ناخۆشە وە ئەگەر گران ئەبێ پێی خۆشە وە کەسێك «تەعامی»
موسڵمانان گران بکا خوا بە پێ ویستی ئەزانێ کە بیخاتە دۆزەخ
سەرەو بن بە راستی ئەو گوناهەی کە لە «مەنع» کردنی تەعام دایە
ئەوەیە کە ئینسان تەعام بکررێ لە وەختی گرانیدا وە هەڵی بگرێ
بگرێ بۆ وەختێکی کە خەڵك پێ ویستی یان پێ ئەبێ ئەو وەختە بە
گرانی بخۆیان بفرۆشێ ئەگەر « وارداتی » ماڵی خۆت بێ زەرەری نی‌یە
یا بەوبیازەی هەڵی ئەگری هەر زەرەری نی‌یە •

## « باسی فیل کردن له سەودادا »

پێغمبەر «ص» فەرمویەتی کەسێك شەرری لەگەڵ تێمە بکا ئەوە اومەتی من نی یە وە کەسێك «حیلە» لە «معاملە» دا بکا اومەتی من نی‌یە ئەسەف بۆ خەڵکی ئێستاکە گشتیان خۆیان بە اومەتی پێغمبەر ئەزانن لەگەڵ ئەوەشدا قسەکەیان درۆیە ، جارێکی پێغمبەر «ص» رابرد بەلای کۆگەنمێك دا دەستی لێدا گەنمەکە تەرر بوو فەرموی ئەوە چی‌یە ئەی خاوەن تەعام عەرزی کرد ئەوە باران لێ‌ی داوە فەرموی بۆچی ئەوەی عەیب دارە لە سەرەوەی ناخەی هەتاکو خەڵك بی بینێ نازانی لە اومەتی من نی‌یە ئەو کەسەی «حیلە» ئەکا لە سەودادا کەسێك شتێك بفرۆشێ عەیبێکی هەبێ ئاشکرای نەکا ئەوە لە ژێر «رقی» خوادایە مەلائکەت لەعنەتی لێ ئەکەن هەتاکو تۆبەی ئەکا ، جارێکی « ابو هريرة » چاوی بە یەکێك کەوت ئاوی تێکەڵی شیر کردبوو ئەی فرۆشت فەرموی چی ئەکەی لە رۆژی قیامەتدا کە داوایان لێ کردی ئاوەکە لە شیرەکە جیاواز بکەیەوە ، وە بێ وێستە بەیان کردنی عەیبی ماڵێك کە ئەی فرۆشی ئەگەرچی ماڵی خۆشت نەبێ بە «صورەتی» ئامۆژگاری بێ‌ی بڵێ‌ی هەر وەکو پێویستە بەیانی عەیبی ئەو کەسە بکەی کە خەریکی ژن خواستنە و گوناهی تێدا نی‌یە بەڵام نیازت غەرەز نەبێ وە هەم حەرامە رەواج پێ دانی ماڵ فرۆشتن بە سوێندی بە درۆ ، پێغمبەر «ص» فەرمویەتی سێ کەس هەن خوا تەماشان ناکا بە رەحم لە رۆژی قیامەتدا وە عەزابی توندیان هەیە سێ جار وای فەرمو عەرزیان کرد ئەوانە حاڵیان زۆر خەرابە ئەوانە کێن فەرموی ئینسانی زیناکەرو ئینسانی بە فیزو کەسێك کوتاڵێکی هەبێ

بە سوێندی بە درۆ ڕەواجی پێ بدا ، وە فەرمویەتی خۆتان دوورخەنەوە لە سوێند لە سەر سەودا بە راستی لە وایانەیە لە یەکەم جارەوە زیاد بکا بەڵام بێ بەرەکەت ئەبێ لە دواییدا .

## « باسی فیل کردن لە کێشان و پیواندا »

خوای تبارەك تعالا فەرمویەتی « ویل للمطففین الذین اذا اکتالوا علی الناس یستوفون واذا کالوهم او وزنوهم یخسرون الا یظن اولئك انهم مبعوثون لیم عظیم یوم یقوم الناس لرب العالمین » مانای « وەیل » هەیە وەیل بری تیە لە توندی عەزاب یا جێگەیەکە لە دۆزەخ دا ئەگەر کێوی دونیای بخرێتە ناو هەموویان ئەتوێنەوە جا ئەو وەیلە بۆ ئەو کەسەیە کە فێڵ ئەکا لە پێوانو کێشاندا لە ماڵی خەڵك وە قاعدەیان وایە ئەگەر بۆ خۆیان ئەپێون زیادی ئەکەن وە ئەگەر بۆ خەڵك ئەپێون کەمی ئەکەن بۆ ؟ مەگەر بیریان وانی‌یە ئەو کەسانە کە زیندوو ئەکرێنەوە لە ڕۆژێکدا کە زۆر گەورەیە کە ڕۆژی قیامەتە وە خەڵك ڕائەگیرێ لە خزمەت خوای هەشتا هەزار جۆرە عالەم (سید) فەرمویەتی سەبەبی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە ئەوەبوو اکە پێغمبەر (ص) تەشریفی هات بۆ (مدینە) پیاوێکی لێ بوو ناوی (ابو جهینە) بوو دووربەی هەبوو بە چووکەکە ئەی فرۆشتو بەگەورە کە ئەی کڕی جاخوای گەورە ئەو ئایەتەی نارده خوارەوە پێغمبەر (ص) ووتی بەوکەسانەکە کاروبازی کێشانو پێوانیان هەبوو فەرموی ئاگاداری ئەوسەودایە بکەن چونکە فێڵ کردن لەوێشەدا سەبەبی بە هیلاك چوونی اومەتەکانی پێشوبوە ، وە جارێکی پێغمبەر (ص) ڕووی

کرده کۆمەڵی کۆچ کەرەکان (مهاجرین) فەرموی پێنج رەووشت هەن خەراپەیان لێ پەیدا ئەبێ پێ ویستە خۆیان لێ بپارێزن و پەنا بەخوا بەرن ، لەوگوناهانەیە هەر وەختێك لە ناو میللەتێك (فاحشە) پەیدابوو ئەو میللەتە تووشی ناعون و نەخۆشی وا ئەبن کە زەمانی زوو نەبوە وە هەر وەختێك فێڵ یان لە تەرازووو پەیدا کرد خوا گرانیان بۆ ئەنێرێ وە زەوی هیچ نارروێنێ وە مەسرەف بەزەحمەت ئەبێ وە گەورە زوڵمیان لێ ئەکا وە هەروەختێك زەکات(منع) کرا خواش باران (منع) ئەکا ئەگەر لە بەر زیندەوەری تر نەبایە هەر تە ئەباری لە بنرا ، وە هەر وەختێك «معاهدە»ی خوا بەجێ نەهات خوا «مسلط» ئەکا دوژمنێك لە ناو موسڵمانان وە ئەو ماڵەی هەیانە لێیان ئەستێنن ، وە هەر وەختێك خەڵك بە ئارەزوی خۆی لە فەرمانەکانی دیندا جووڵانەوە خوا غەمیان ئەخاتە ناو : وە حەزرەتی علی «ر» فەرمویەتی داوامە کە حاجەتی خۆت لەوکەسەی رۆژی لە تەرا زوو ور بەدایە «خیانەت» وە ئەو قسە زۆر جوانە کە ووتراوە عەزابی توند هەیە بۆ ئەوکەسەی کە ئەفرۆشێ بە دەنکێك کە ناقسی ئەکا ئەو بەهەشتەی کە پانایی هێندەی ئەرزو ئاسمانە وە بۆ خۆی ئەکرێ شێوێکی دۆزەخ کە ئەتوێ نێتەوە هەمو کێوی دونیایە ، ئاشکرایە کە حیلە کردن لە کێشانو پێواندا حەرامە و لە گوناهی گەورەیە وە یەکێك لە (حیلە) ئەوەیە کاتێك کوتاڵ لێ ئەکاتەوە بۆ فرۆشتن زۆر لە کوتاڵە کە ئەنووسێ بۆ لێ کردنەوە وە ئەگەر ئەی کرێ کوتاڵەکەی لە سەر خۆ رائەکێشێ ئەوکەسانەش (داخلی) ئەو عەزابە بە شدەتەن ، وە یەکێك لە باش بوونی سەودا ئەوەیە کە شتێ

ئەکرری روخۆش بی یاشتێ ئەفرۆشی هەر روو خۆش بی یا
ئەگەر ماڵەکەیان بۆ هێنایە وە وەری بگریەوە بە رو خۆشی وە
قوسووری لە یەکەم سەودادا نەکەی هەتا «ممکن» بێ یەکەم سەودا
باشە وە تەماعی قازانجی زۆر نەکەی ماڵەکەت «تأخیر» نەکەی زوو
بی فرۆشەو زوو بیکرەوە ، وە دووبارە حەرامە سەودا لە
سەرسەودای کەسێك کە رێك کەوت بن بێی بلێی بی دە بە من
من زیاترت ئە دەمێ یا من شتی باشترم هەیەو بە هەرزان تر ئەت
دەمێ یا نرخ زیاد بکەی بۆ ئەوەی کەسێکی تر زۆری پێ بداو
زەرەری لێ بکەوێ ئەوانە هەموویان حەرامن چونکە ئازاری
موسڵمانانی تێدایە •

## « باسی قەرزکردن و شت بە قەرزدان »

پێغەمبەر «ص» فەرمویەتی کەسێك قەرز بکاو مە بەستی دانە
وە بێ خوا «موفقی» ئەکا بۆدانەوە وەکەسێك هەرمەبەستی وەرگرتن
بێوخواردن بێ خوا «موفقی» ناکا بۆ دانەوە وە کەسێك بی بێ قەرز
بداتەوەو نەیداتە وەو مرد ئەو کەسە لە قەبریدا زنجیر کرا وە هەتاکو
قەرزەکەی بۆ ئەدرێ تەوە ، وە فەرمویەتی کەسێك قەرزی کردو
قوسووری کرد نەیدایەوە خوا لە رۆژی قیامەتدا ئەفەرموێ پێت وابوو
کە حەقی عەبدی من ئەفەوتێ من حەقی عەبدی خۆم نافەوا تێنم ئەو
وەختە ئەگەر قەرزدارەکە چاکەی هەبێ ئەی خەنە سەر چاکەی
خاوەن ماڵەکە وە ئەگەر هیچ چاکەی نەبێ لەگوناهی خاوەن
قەرزەکە ئەخەنە سەرگوناهی قەرزدارەکە ، وە هەتا حەقە مارەیی

مارەیی ژن زۆر پێ وپەستە بدرێ چونکە کەسێك بیری وابێ حەقە مارەیی نەدا «تصرفی» ژنەکەی وەکو زینا ئەچێ ، شەخسێك عەرزی پێغمبەری کرد ئەگەر بە شەهیدی بمرم لە رێگەی خواداو سەبرم هەبێ وە هەتا هەتایە لە غەزا پاش نەکەمەوە گوناهم مەحو ئەبنەوە ؟ فەرمووی بەڵێ وەختێکی پیاوەکە رۆیی پێغمبەر «ص» بانگی کردوەو فەرمووی بەڵێ وایە بەس قەرزنەبێ ئەو وە لاناچێ جبرەئیل «ع» وا ئەفەرموێ وە فەرمووی خوا خۆش ئەبێ لە هەمو گوناهێکی شەهید الا لە قەرز نەبێ ، جارێکی جەنازەیەکیان هێنا بۆ خذمەت پێغمبەر (ص) نوێژی لە سەر بکا فەرمووی قەرزی لە سەرە عەرزیان کرد بەڵێ فەرمووی ماڵێ لە پاشە ؟ عەرزیان کرد هیچ ماڵی لە پاش نی یە فەرمووی بۆ خۆتان نوێژی لە سەر بکەن حەزرەتی ـ عەلی ـ (ر) فەرمووی قەرزەکە (عائدی) من بێ و بۆی ئەدەمەوە جا ئەو جارە پێغمبەر (ص) تەشریفی پێش کەوت و نوێژی لە سەر کرد وە فەرمووی بە حەزرەتی (علی) خوا رەزگارت بکا لە ئاوری دۆزەخ هەر وەکو تۆ بووی بە هۆی رەزگار بووی ئەو موسڵمانە لە ئاوری دۆزەخ وە فەرمووی هەر موسڵمانێك برای موسڵمانی خۆی رەزگار بکا لە قەرز خواش ئەو رەزگار ئەکا لە عەزابی دۆزەخ ، وە پێغمبەر «ص» فەرموویەتی قەرز نەدانەوە بۆ پیاوێکی پێی بکرێ قەرزەکە بداتەوە زوڵمە وە حەق وایە لە کۆڵی نەبی یەوەو حەلاڵە باسی نەدانەوەی بکەی و بە جۆرێکی «مناسب» ئەو شەخسە ئەزیەت بدەی ، وە پێغمبەر «ص» فەرموویەتی کەسێك مۆڵەت بگرێ لە پیاوی فەقیر یا شتێکی لە قەرزەکە لێ خۆش

پێ یا بە تەواوی گەردنی ئازاد بکا ئەوە خوا ئەی پارێزێ لە ئاگری دۆزەخ وە سێبەری لێ ئەکرێ لە ڕۆژی قیامەتدا وە هەم بە هەموو ڕۆژێکی کە سەبری لێ ئەگری خێری بەخشینی قەرزەکەی ئەگاتێ وە ئەگەر وەختی ستاندنی قەرزەکە هاتو سەبری لێ گرت بە (کلی) ڕۆژێکی خێری دوو هێندەی قەرزەکەی خێر ئەگاتێ وە پێغەمبەر (ص) فەرمویەتی خوا لە ڕۆژی قیامەتدا بانگی ئەو کەسەی ئەکا کە قەرزدار بوە و دەسەلاتی نەبوە بیداتەوە ئەفەرموێ ئەو قەرزەت چی لێ کرد عەرزی ئەکا خوایە ئەوماڵەی کە قەرزم کردوە بۆ خۆت ئەزانی نیازم هەر خواردن نەبوەو نەی دەمەوە بەلام یا لێیان دزیوم یا سووتاوە یا زەرەرم تێدا کردوە خوا ئەفەرموێ عەبدی من ڕاست ئەکا وە من پێم ئەکرێ قەرزی ئەو عەبدە بدەمەوە خوا دڵی خاوەن قەرزەکە ڕازی ئەکاو ئەمر ئەکـا شتێك دێنن لـە تەرازوی کرداری ئەو شەخسەی داوێن هەتا عەمەلی چاکەی بە سەر عەمەلی خەراپەیدا سەر ئەکەوێ و ئەچێ تە بەهەشت بە فەزلو ڕەحمی خوا •

## « ئەوە ئاگادار کردنەوەیە »

بە ڕاستی قەرزکردن لە گەڵ نی‌یەتە نەدانەوەیا جێگەی وات نەبو بیدەیەوەو زەروریش نەبوی وە ئەوکەسەی قەرزەکەی لێ ئەکەی حاڵی تۆ نەزانێ حەرامە وە ئەگەر پێت بکرێ قەرز بدەیەوەو نەی دەیە وە گوناهە وە ئەگەر (حاکم) پێ‌ی ووت بیدەوەو (مانع) بوو دروستە بە ( انواعي ) ئازار ئازار بدرێت هەتاکو

قەرزەکە ئەداتەوە یا ئەمرێ ، وە هەم حەرامە سەفەر بۆ کەسێك قەرزی دەرحاڵەی لەسەربێ وەکەسێك ئاشکرابوو کە فەقیرە دروست نی یە حەبس بکرێ وە پێ ویستە (واجبە) سەبری لێ بگیرێ هەتا خوا روحمێ ئەکاو ماڵی ئەبێ وە یەخەگرتنی دروست نی یە •

## «باسی خەراپی باج استلاکە»

پێغمبەر (ص) فەرمویەتی ناچێتە بەهەشت ئەو کەسەی استیلاك ئەستێنێ ئەگەر تۆبەی لێ نەکات وە ئەی فەرمو ئەگەر توشی باج ئەستێنێ بوون بی کوژن وە پێغمبەر (ص) فەرمویەتی لە شەوی نیوەی (شعباندا) ئاواڵە ئەکرێتەوە دەرکەی رەحمەتی خوا بانگ ئەکرێ کێ نیازی هەیە بۆی جێ بە جی بکرێ کێ ناررەحەتی هەیە لە سەری لاچێ هیچ موسڵمانێك نامێنێ دوعایە بکاو رەحمی پێ نەکرێ الا ئەوژنە نەبێ کە بە ئارەزوی خۆی زینا ئەکاو ئەو کەسە نەبێ کە دەیەك (عشر) ئەستێنێ ، بە راستی باج ستاندن حەرامە بە (اجماعی علما) و کەسێك پێی حەلال بێ کافر ئەبێ یا بڵێ ئەوە حەقی سڵطانە پێی وابێ حەقێکی (شەرعی) یە وە حەرامە لە سەر کەسێکی نوسینو حساب بزانێ یارمەتی یان بدا ئەگەر مەبەستی یارمەتی ئەو زاڵمانە بێ کە خواو پێغمبەر لەعنەتی یان لێ کردوون •

## (باسی زوڵم)

خوای گەورە لە قورئاندا فەرمویەتی (ولا تحسبن الله غافلا عما يعمل الظالمون انما يؤخرهم ليوم تشخص فيه الابصار) مانای

پێتان وا نەبێ کە خوا ئاگادار نی‌یە لەو ئیشەی کە زاڵمەکان ئەیکەن خوا هێندێکیان دواڵ ئەخا بۆ رۆژی قیامەت کە چاو زەق‌کردن نەبێ بێ یان نامێنێ ، وە خوا فەرمویە ( یاایها الذین آمنوا لاتأکلوا اموالکم بینکم بالباطل الا ان تکون تجارة عن تراض منکم ولا تقتلوا انفسکم ان الله کان بکم رحیما ومن یفعل ذلك عدوانا او ظلما فسوف نصلیه نارا وکان ذلك علی الله یسیرا ) وە هەم خوا فەرمویە ( وما للظالمین من حمیم ولا شفیع یطاع ) مانای ئەی موسڵمانینە مەخۆن ماڵی یەك تر بە رێگەی بێ شەرعی و بەتاڵ . الا مەگەر بە رێگەیەکی کە شەرع پێی باشە وەکو معامله کە بە رەزانی یەت بێ ، وە هەم یەك تر مەکوژن بە راستی خوا زۆر بە رەحمە لەگەڵتان بەڵام کەسێك ئەو گوناهە گەورانە بکا پێمان ئەکرێ کە هەڵی واسین لە ئاوری « دۆزەخدا » وە خوا ئەوەی زۆر پێ ئاسانە ، وە شەخسی زاڵم لە رۆژی قیامەتدا دۆستی وای نی یە و تکا کاری وای نی یە کە خوا بە قسەی بکا ، پێغمبەر «ص» لە کاتی « حجة الوداع » دا لە « منی » ( خطبه ) یدا فەرموی ئەی موسڵمانینە بزانن کوشتنی یەك تر لە سەر ئێوە حەرامە و ماڵ خواردن بە ناحەقی حەرامە و شەرموو ناموویسی یەك تر بردن حەرامە هەروەکو ئەمرۆ لەو مانگە و لەو شارەدا چەندی رێز گیراوە نەبێ ئەواڵ پارێزگاری ئەو فەرمایانە بکەن وە لێرە بە دواوە بەخزمەت خوا ئەگەن پرسیار لە کردەوە کانو ئەکرێ ، لە پاش من مەبنەوە بە کافر کە هێند یکیان بە ناحەق هێندێکتان بکوژن ، وە خوا فەرمویە ئەی عەبد من زوڵمم لە سەر خۆم حەرام کردوە وە لە ناو ئێوەشدا حەرامە

زولّم له یەك تر بکەن چونکە زولّم تاریکی رۆژی قیامەتە ، پێغمبەر « ص » فەرموی ئێوه ئەزانن « مفلس » کێیە عەر زبان کرد (مفلس) له ناو ئێمەدا ئەوەیه که پارەی نەبێ و کەل و پەلی نەبێ پەرموی «مفلس» له اومەتی من ئەوەیه که له رۆژی قیامەتدا ئامادە ئەکرێ و خێری نوێژو رۆژوو و عەمەلی چاکی هەیە بەلام جنێوی بە یەکێك داوەو یەکی کوشتوه جا ئەو وەختە خێر ئەو کەسەی ئەبەشرێتەوه بە سەر ئزولّم لێ کراوەکاندا ئەگەر خێرەکەی بەشی نەکرد له گوناهی زولّم لێ کراوەکان ئەخرێتە سەر گوناهی ئەو زاڵمەو هیچ کردەوەی باشی نامێنێ تەوه له پاشان له دۆزەخ داوئێژرێ ، پێغمبەر (ص) فەرمویەتی زولّم سێ جۆرە : یەکێك کافر بوونە ئەو کەسە خوا لێی خۆش نابێ و هەتا هەتایە له دۆزەخدا ئەبێت یەکی تر ئەوەیه که زولّم له نەفسی خۆی بکا ئەو کەسە ئەگونجێ خوا لێی خۆش بێ وە یەکێکی تر ئەوەیه که زولّم و غەدر بکا له موسڵمانان ئەو کەسە خوا لێی خۆش نابێ وە فەرمویە کەسێك بە ئەندازەی بستێك زەوی زولّم له کەسێك بکات خوا له رۆژی قیامەتدا له هەرحەوت قاتی زەوی تەوقی بۆ دروست ئەکاو له ئەستۆی ئەکرێ مانای ئەستۆی گەورە ئەکرێ وەك تەوق له گەردنی دا ئەبێ هەتا (محکمە)ی خەڵك تەواو ئەبێ که بریتی‌یە له پەنجا هەزارساڵ،وە کەسێك پارێز گاری موسڵمانێك بکا له زاڵمێك خوا له رۆژی قیامەتدا یەك (مەلائکە) ئەکا بە پارێزکەری ئەو شەخسە پارێزگاری ئەکا له عەزابی دۆزەخ وە فەرمویەتی ئاگاداری (دوعای) زولّم لێ کراوبن خوا دوعای گیرا ئەکا چونکە داوای حەقی خۆی

ئەکا لە خوا وە خواش حەقی کەس نافەوتێنێ وە ئەگەر بۆ خۆی بێ دینی پشی بێ «دعای» گیرایە ، پێغمبەر «ص» فەرمویەتی لـــە رۆژی قیامەتدا دەستی پیاو ژن ئەگیرێ بانگ ئەکەن ئەوە فلان کەسی کورری فلان کەسە کێ حەقی لە سەر ئامادەبێ تاکو حەقەکەی بۆ بستێنین جا ئەو وەختە ئینسان خۆش حاڵ ئەبێ هەتا پێی خۆشە کە حەقی لە سەر « ئەولاد » ی خۆی هەبێ لە پاشان پێغمبەر «ص» ئەم ئایەتەی خوێندەوە « فلا انساب بينهم » مانای ئەم رۆ نەسەبە لە ناودا نی یە مانای تەماشای نەسەبە ناکرێ بۆ حەق ستاندن دوایی فەرموی خوا خۆش ئەبێ لە حەقی خۆی بە ئارەزوی خۆی ، بەلام لە حەقی خەڵك خۆش نابێ ، لە پاشان ئەو عەبدە حازر ئەکرێ بۆ لای خەڵك خوا بە خاوەن حەقان ئەڵێ وەرن بۆ حەقی خۆتان عەبدەکە ئەڵێ خوایە خۆ من هیچ دونیام نەماوە چۆن حەقیان بدەمەوە «حق تعالى» بە مەلائکەتان ئەڵێ بگرن لە چاکەی ئەو عەبدە بیدەن بە خاوەن حەق بە ئەندازەی داوای خۆی ئەگەر ئەو شەخسە بە باشی مردبیو بە ئەندازەی « مثقاله ذەرە» یەکی چاکە بۆ بمێنێ ئەوە خوا بۆی زیاد ئەکاو ئەچێتە بەهەشت ، وە ئەگەر ئەو عەبدە بە خەرابی مردبێو هیچ چاکەی نەماوەتەوەو داواکاریش ماون خوا ئەفەرموێ لە خەرابەی خاوەن حەقەکان هەڵگرن و لە سەر خەرابەی ئەو عەبدەی دانێن و ئەو وەختە بیخەنە ناو دۆزەخ •

# « باسی خواردنی مالی هەتیو »

خوا ئەفەرموێ «ان الذین یأکلون اموال الیتامی ظلما انما یأکلون فی بطونهم نارا وسیصلون سعیرا » ، مانای ئەو کەسانە کە مالی هەتیوان ئەخۆن بە ناحەق ئەوە ئاور ئەخەنە ناو زکیان وە هەڵ ئاوەسرێن لە ئاگری دۆزەخدا پێغمبەر (ص) فەرموی خۆتان بپارێزن لە حەوت گوناهان کە ئینسان بە هیلاك ئەبەن عەرزیان کرد ئەو گوناهانە چین فەرموی یەکیان کافر بوونەو یەکیان سیحرکردنەو یەکیان کوشتنی بە ناحەقەو یەکیان خواردنی سووتەو یەکیان خواردنی ماڵی هەتیوەو یەکیان هەلاتنە لە سەفی غەزاو یەکیان ئەوەیە کە بەکەسێك بڵێی «زنا» ت کردوەکە لە سەری (ایسبات) نەبێ ، وە فەرمویەتی چوار جۆرە ئینسان هەن حەقە لەسەر خوا کە نەیان باتە بەهەشتو «نعمەتی» بەهەشتیان بە «قسمە» ت نەکات یەکیان سووت خۆر یەکیان ئەوەیە ماڵی هەتیو بخوا بە ناحەق یەکیان ئەوەیە کە بە فەرمانی دایکو باوکی نەکا ، بە راستی خواردنی ماڵی هەتیو لە گوناهە گەورەکانە بە ئیتفاقی زانایان وە جیاوازی لە بەینی کەمو زۆری دا نی‌یە •

# « باسی ئاگاداری هەتیوو خزمەتی بینەوایان »

پێغمبەر «ص» فەرمویەتی من لە گەڵ ئەو کەسەی کە هەتیو بە خێو ئەکا جووتم لە بەهەشتا وە فەرمویە کەسێك سێ هەتیو بەخێو بکا خێری وەکو کەسێکە کە شەو بە خەبەر بێ و هەموو رۆژ بە

ڕۆژوو بێ وە هەم خێری وەکو ئەو کەسەیە کە هەموو کاتێك شیری خۆی بەکار بێنێ لە غەزادا ، وە من لە گەڵ ئەو کەسە لە بەهەشتا برام وەکو ئەو دوو قامکە بە یەکەوە جووتین ئیشارەی بە قامکی شادەو نێوەراست کرد وە هەم پێغمبەر (ص) فەرموی چاك ترینی مالان ئەو ماڵەن کە هەتیو یان تێدا بەخێو ئەکرێ و ئاگاداریان ئەکرێو چاکەیان لە گەڵ ئەکرێ ، وە خەراپترینی ماڵ ئەو ماڵەیە کە هەتیوی تێدابێ و چاکەی لەگەڵ نەکرێ ، وە فەرموبەتی لە بەهەشتا جێگەیەك هەیە «دار الفرح» ی پێ ئەڵێن ناچێتە ئەو جێتە ئەو جێگەیە تەنها کەسێك نەبێ کە هەتیو بەخێو ئەکا ، وە پێغمبەر (ص) فەرمویەتی من لە پێش هەموو کەسێکدا دەرکەی بەهەشت لێ ئەکەمەوە الا ژنێك نەبێ کە تاڵووکە لە من ئەکا پێی ئەڵێم تۆ کێی وا تاڵووکە ئەکەی ئەڵێ من ئەو ژنەم کە لە سەر هەتیوان دانشتوم و خزمەتم کردون ، وە ئەی فەرمو سوێندم بەو کەسە کە منی گێرراوە بە پێغمبەر خوا عەزاب نادا لە ڕۆژی قیامەتدا ئەو کەسەی رەحمی بە هەتیو کردبێ و قسەی نەرمی لەگەڵ کردبێ وە ئەو کەسەش کە لە خۆی زیاد هەبوەو لە دراوسێکانی بە حەیف نەزانیوە ، وە ئینسان کە دەست بە سەری هەتیودا بێنێ بۆ ڕەزانی یەتی خوا بە هەموو موێکی دەستی وێ ئەکەوێ خوا خێرێکی بۆ ئەنووسێ ، ڕوایەت کراوە کە خوا وەحی بۆ حەزرەتی «یعقوب» نارد کە هۆی ناڕەحەتی تۆ بۆ « یوسفو » چاو کوێر بوونی تۆ ئەو بوە کە جارێکی هەتیوێك هات بۆلات کە بە ڕۆژوو بوو برسی بوو تێوەش گۆشتان

ئەخوارد و بەشی هەتیوەکەتان نەدا بۆیە تووشی ئەو ناررەحەتی یە بووی ، پاشان خوا فەرمووی خۆشەویست ترین کەس لای من هەتیون وە فەرمانی کرد بە حەزرەتی «یعقوب» کە تەعام دروست بکا وە هەتیوو فەقیران کۆبکاتەوە بی خۆن .

## « باسی خەیانەت »

خوا لە قورئاندا پەرمویەتی « یا ایها الذین آمنوا لاتخونوا الله والرسول وتخونوا أماناتکم وانتم تعلمون» مانای ئەی موسڵمانینە تیوە خەیانەت مەکەن لە گەڵ خواو پێغمبەر بەو مانایە کە خەیانەت لە ئەمانەتی یەك تردا بکەن وە تیوەش ئەزانن کە خەیانەت شتێکی خەراپە ، وە هەم خوا فەرمویەتی «ان الله لایهدی کید الخائنین» بە مەعلومی خوا هدایەتی ئەو کەسانە نادا کە حیلە ئەکەن لە ئەمانەتدا ، وە هەم پێغمبەر «ص» فەرمویەتی ئیمان نی یە بۆ کەسێك خەیانەتی هەبێ وە نوێژ دروست نی یە بۆ ئەوکەسەی دەست نوێژی نەبێ وە دین نی یە بۆ کەسێك نوێژ نەکا مسئلەی نوێژ بۆ دین وەکو سەروایە بۆ لەش دیارە لەش کە بێ سەربێ بەکەڵك نایە دینیش نوێژی تێدا نەبێ بە کەڵك نایە ، وە هەم فەرمویەتی نشانەی «منافق» سێ شتە ئەگەرقسە ئەکا درۆ ئەکاو ئەگەرپەیمان ئەدا بەجێی ناهێنێو ئەگەر بوو بە ئەمین دار خەیانەت ئەکا ، وە هەم فەرمویەتی سێ گوناە هەن ئەگەر کەسێك تێیدا هەبن ئەوە «منافقە» با نوێژ بکاو رۆژو بگرێو و «حەج» بکا بڵێ من موسڵمانم ئەگەر قسە بکا درۆ بکا وە ئەگەر پەیمان بدا پێچەوانە وە جووڵێ وە ئەگەر کرا

بە ئەمین دار خەیانەت بکا وە کەسێك خەیانەت لە گەڵ هاوبەشی خۆیێ بکا کە کردوویەتی بە ئەمیندار من بەریم لەو کەسە مانای ئومەتی من نی یە ، وەرگیراوە لە حەزرەتی «عەلی» (ر) ئەی فەرمو لە خذمەت پێغمبەر (ص) دانیشتبوین پیاوێك هات لە ئەهلی (عالیە) عەرزی کرد «یارسول اللّٰه» خەبەرم دەیە لەو دینەدا چ شتێك ئاسانە و چ شتێك بە زەحمەتە فەرموی ئەی برای خۆم ئاسانتر لە هەموشتێك ئەوەیە بلێیێ : « اشهد ان لا اله الا اللّٰه وان محمدا رسول اللّٰه » وە بە زەحمەتتر لە هەموو شتێك ئەوەیە کە ئاگاداری ئەمانەت بکەی ئاگاداربە ئەی برای خۆم دین نی‌یە بۆ کەسێك ئەمین‌نەبێ وە نوێژی خێری نی‌یەو حەجی خێری نی‌یە : وە پێغمبەر « ص » فەرموویەتی ئەگەر ماڵی کافران ببێ بە دەوڵەتی وە ئەمانەت ببێ بە قەرزو پیاو فەرمانبەری ژنی خۆی کردوو بێ ئەمری دایکی کردو ئەزیەتی باوکی داو دەنگ بەرز بوونە وە لە مزگەوتاندا پیاوی نانەجیب بوو بە گەورەی گەل و رێزی ئینسان گیرا لە بەر ترس‌و شەرراب خورایەوە بە ئاشکرا و بەرگی ئاوریشم دەبەرکراو ژنان گوتنیان دەست پێ کرد و ئاخری ئەو ئومەتە بە ئومەتی پێشو رازی نەبوو جا ئەو وەختە چاوەرروانی بایەکی سووربکەن یا رۆچوونی ئەرز ، وە پێغمبەر «ص» لە پاررانەوەدا فەرمویەتی خوایە پەنا ئەگرم بە تۆ لە برسیایەتی کە خەرایە وە پەنا ئەگرم بە تۆ لە خەیانەت کە وەزعێکی خەرایە •

## « باسی قسه نه‌کردن له گه‌ل موسلمان »

پێغمبه‌ر (ص) فه‌رمویه‌تی حه‌لال نی‌یه بۆ موسڵمان که ته‌رکی قسه بکا له گه‌ڵ موسڵمان زیاتر له سێ رۆژ چونکه ئه‌و که‌سانه رووبان دوورخستۆته‌وه له حه‌ق به مه‌رجێك له سه‌ر ئه‌و وه‌زعه بن وه هه‌ر کامێکیان له پێشدا په‌شیمان بۆوه قسه‌ی کرد ئه‌بێته هۆی ره‌ش بوونه‌وه‌ی گوناهه‌کانی وه ئه‌گه‌ر سه‌لامی لێ کردو وه‌لامی نه‌داوه مه‌لائکه سه‌لامی ئه‌ستێ نه‌وه و «شه‌یتان» وه‌لامی ئه‌وه‌ی تر ئه‌داته‌وه وه ئه‌گه‌ر بمرن له سه‌ر ئه‌و حاڵه ناچنه بهه‌شتێ وه فه‌رمویه‌تی حه‌لال نی‌یه بۆ مسڵمان ته‌رکی قسه له گه‌ڵ مسڵمان زیاد له سێ رۆژ وه‌ختێکی تووشی یه‌ك تر ئه‌بن روو وه‌ر ئه‌گێرن وه چاك ترینی وبان ئه‌وه‌یه که سه‌لامێ بکا ، جا « علما » وایان فه‌رموه له مانای (حه‌دیثدا) که به سه‌لام کردن گوناه له سه‌ر ئینسان لائه‌چێ ، وه پێغمبه‌ر (ص) فه‌رموویه‌تی له هه‌موو دووشه‌مه‌و پێنج شه‌مه‌یه‌کدا کرده‌وه‌ی ئینسان ئاشکرا ئه‌کرێ له خذمه‌ت خوادا هه‌رکه‌سێك دوعای لێ خۆش بوون بکا لێی خۆش ئه‌بێ مه‌گه‌ر کافر بێ یا ئه‌وکه‌سه بێ که له گه‌ڵ برای موسڵمانی خۆی رقی هه‌بێ خوا ئه‌فه‌رموێ لێیان گه‌رێن تاکو رێك ئه‌که‌ون دیاره که ته‌رکی قسه‌کردن له گه‌ڵ موسڵمان حه‌رامه به‌ڵکه کۆمه‌ڵێك له زاناکان فه‌رموویانه له گوناهی گه‌وره‌یه مه‌گه‌ر له به‌ر رێگرێکی شه‌رعی نه‌بێ وه‌کو ئه‌و شه‌خسه ئه‌هلی «بدعة» بێ یا «فاسق» بێ یا بێ دین یه‌که‌شی وون بێ وه قاعده‌ی وایه هه‌ر وه‌ختێك ده‌رکه‌وت ئه‌و شه‌خسه رووی له چاکه

کردوه ئەو وەختە قسەی لە گەڵ بکە وە الا قسەی بە کەن مەکە جا کەوابوو سوپاس بۆ خوا کە ئیستاکە لە گەل بەشی زۆری خەڵك قسە نەکردن دروستە •

## « باسی بی ئەمری دایكو باوك »

خوا فەرمویەتی « وا عبدوا الله ولا تشركوا به شیئا وبالوالدین احسانا » مانای ئەی خەڵك ئێوە عبادەتی خوا بکەن وە هیچ جۆرە کفرتان نەبێ و چاکەش بکەن لە گەڵ داکو باوك «عبداللەی امامی عباس» ئەفەرموێ مانای ئەو ئایەتە وایە کە لوتف لەگەڵ داك و باب بکەن و گەردن کەچیان بۆ بکەن و وەلامیان بە توندی مەدەنەوەو بە رق تەماشایان مەکەن و دەنگی خۆو بە سەر دەنگی واندا بەرز مەکەنەوە بەڵکە لە بەر دەستی داك و باوك راوەستن وەکو عەبد لە بەر دەستی گەورەی خۆیدا رائەوەستێ وە هەم خوا فەرمویەتی « ان اشكر لی ولوالدیك الی المصیر » مانای سوپاسی من بکەن و سوپاسی داك و باوك بکەن لە دوایدا هەر ئەگەررێنەوە بۆ لای من جا تەماشا کەن ئەی خەڵك خوا هەموو لایەکمان «موفق» بکان چۆن خوا شوکرانەی داکو باوکی لە گەڵ شوکرانەی خۆی جووت کردوە ، «عبداللەی ئیمامی عباس » (ر) فەرموویەتی سێشت هەن بە بێ سێ شت وەرناگیرێن بەکیان ئەوەیە فەرمانبەری خوا بەبێ فەرمانبەری پێغمبەر وەرناگیرێ وە نوێژ کردن بەبێ زەکاة وەرناگیرێ وە شوکرانەی خوا بە بێ شوکرانەی باب و داك وەرناگیرێ بۆیە پێغمبەر (ص) فەرمویەتی رەزای خوا لە گەڵ رەزای باب و داکە وە رقی خوا لە گەڵ رقی

باب و داکه ، وه دیاره شەخسێك هات بۆ خزمەت پێغمبەر «ص»
عەرزی کرد ئەچم بۆ غەزا فەرموی داكو باوکت ماون عەرزی کرد
بەڵێ فەرموی خزمەتی ئەوان بکە بۆ تۆ خێری غەزای هەیە ، جا
تەماشا کەن کە خزمەتی بابوداك گەورەترە لە غەزا ، وە پێغمبەر (ص)
فەرموویەتی یەکێك لە گوناهی گەورە کافر بوونەو یەکێك بێ فەرمانی
داكو بابەو یەکێك (قەتل) کردنەو یەکێك سوێندی بە درۆیە ، وە
سێ شت هەن کردەوەی باش لە گەڵ وان سوودی نی‌یە یەکیان
کافر بوونەو یەکیان بێ ئەمری داك و باب و یەکیان هەلاتنە لە سەفی
غەزایە بەو مەرجەی موسڵمان نیو ئە وەندەی کافران بن یا زیاتر بن ،
پێغمبەر «ص» فەرمویەتی سێ‌کەس هەن خوا بەهەشتی لێ حەرام
کردون بە مەر جێك بەو وەزعە بمرن یەکیان ئەوەیە شەرراب بە
دائم بخواتەوە یەکیان ئە وەیە بێ فەرمانی داك و باوك بکاو یەکیان
ئەو کەسەیە کە دەنگ نەکا کە (زنا) ئەکرێ لە ماڵی ئەوداو بش
زانێ وە هێندێك (علما) ووتویانە ئەوە کەسێکە کە رازی بێ کە خەڵك
بچێ بۆ لای ژنەکەی ئەو بە تەنها هێندێك ئەڵێن ئەوە کەسێکە کە
ژن رائەگرێ بۆ قامو گۆرانی ووتن ، وە فەرموویەتی هەمو گوناهێك
خوا دوای دێخێ هەتا رۆژی قیامەت خوا جەزای لێ ئەستێ نێتەوە ،
الا بێ ئەمری داك و باب نەبێ ئەو گوناهە لە پێش مردندا
خوا جەزای لێ ئەستێ نێتەوە ، خوای گەورە وەحی فەرمو بۆ حەزرەتی
موسی کە رێزی داك و باوکت بگرە چونکە کەسێك رێزی گرتن
تەمەنی درێژ ئەکەمو منداڵی وای ئەدەمێ کە ئەوانیش رێزی وی
بگرن وە کە سێك رێزی وان نەگرێ تەمەنی کورت ئەکەم و منداڵی
وای ئەدەمێ کە رێزی نەگرن •

## « باسی چاکەکردن لە گەل داکو باب »

پرسیار کرا لە پێغمبەر (ص) چ کردەوەیەك رێزی نەگیرێ لە خذمەت خوا فەرموی نوێژکردن لە هەوەڵ کاتیدا عەرزیان کرد لە دوای ئەو چی‌یە فەرموی چاکە کردن لە گەڵ داکو باوك عەرزیان کرد لە دوای ئەوچی یە فەرموی غەزاکردن لە رێی خوادا ، شەخسێك هات عەرزی پێغمبەری کرد زۆرم ئارەزو هەیە لە غەزاکردن و هێزم نی‌یە فەرموی لە داك و باوکت هیچیان ماون عەرزی کرد داکم ماوە فەرموی بررۆ خزمەتی داکت بکە ئەوە بۆ تۆ « حەجەو عومرە » یە و غەزاکردنە ، وە هەر کەسێك تە ماشای داك و باوکی بکات بە کەیف خۆشی و بە رەحمەت خوا خێری حەجێکی قەبوڵ کراوی بۆ ئەنوسێ شەخسێك عەرزی پێغمبەری کرد کێ باشە برایەتی لە گەڵ بگرم فەرموی داکت عەرزی کرد پاش ئەو فەرموی هەر داکت عەرزی کرد لە دوای ئەو فەرمووی باوکت وە فەرموی بەهەشت لە ژێر پێی داکت دەست ئەکەوێ ، شەخسێك عەرزی کرد گوناهێکی زۆر گەورەم کردوە تۆبەم گیرا ئەبێ یا نا ؟ فەرموی داکت ماوە عەرزی کرد نافەرموی پوورت هەیە عەرزی کرد بەڵێ فەرموی بڕۆ خزمەتی پوورت بکە بۆ لابردنی گوناهە کەت ، وە دوعای باوك بۆ مناڵ وەکو دوعای پێغمبەران وایە بۆ ئومەتی خۆیان .

## « باسی قەتع کردنی رەحم »

خوای تباررەك و تعالی فەرمویەتی « واتقوا اللّٰه الذی تساءلون به والارحام » مانای ئێوە خۆتان بپارێزن لە بێ ئەمری خوایەکی وا کە

داوای احتیاجی لێ ئەکەن وە ئاگاداری بەجێ هێنانی رەحم بکەن وە هەم خوا فەرموویەتی « والذین ینقضون عهد الله من بعد میثاقه ویقطعون ما امر الله به ان یوصل ویفسدون فی الارض اولئك لهم اللعنة ولهم سوء الدار » مانای ئەوکەسانەی کە بە تاڵ ئەکەنەوە ئەو شتەی کە برریاریان داوە بە جێی بێ نن لە پاش برروایی پێ هێنانی ، وە قەتع ئەکەن ئەو شتەی کەخوا ئەمری کردوە بە بەجێ هێنانی وە بێدینی ئەکەن لە گەڵ خەڵکی سەر ئەرز ئەوانە دوورن لە رەحمەتی خواو جێگەی زۆر خەراپیان هەیە ، وە ئەوەی کە خوا ئەمری پێ کردوە کە بێتە دی رەحم کردنە بە خەڵك و خزم کە بە جێی نەهێنا خوا ئەو هەررەشەی لێ کردوە ، پێغمبەر (ص) فەرمویەتی وەختێکی کە خوا ئەو خەڵکەی دروست کرد « رەحم» لە خزمەتی دا راوەستاو عەرزی کرد قوربان ئێستا کاتی ئەوەیە کە ئینسان پەنا بۆ تۆ بێنێ لە قەتع کردنی رەحم خوا فەرموی بەڵێ ئەی «رەحم» ئەتۆ رازی نی یەوەی کە هەر کەسێك تۆ بە جێ بینێ منیش رەحمی پێ ئەکەمەوە هەرکەس (رەحم) بەجێ نەیەنێ منیش رەحمی پێ ناکەم عەرزی کرد بەڵێ رازیم ، وە فەرمویەتی هیچ گوناهێك نی یە کە لائقی ئەوەبێ کە بە زوویی عەزاب بۆ خاوەنەکەی بێ لە دونیادا زیاد لەوە کە بۆ قیامەت ئەمێ نێتەوە فیزو بێ رەحمی نەبێ ، جارێکی پێغمبەر (ص) رووی لە صەحابان کرد فەرموی ئەی کۆمەڵی موسڵمانان ئاگاداربن «صلەی رەحم» بەجێ بێنن چونکە خێری سیلەی رەحم زوو بە ئینسان ئەگات ، وە خۆتان دورکەن لە فیز چونکە عەزابی ئەو گوناهە زوو بە ئینسان ئەگات ،

وە خۆتان دوورکەن لە بێ ئەمری داك و باب چونکە بۆنی بەھەشت ڕێگەی ھەزارساڵ ئەرروا بەڵام سوێند بە خوا ئەو بۆنە ناگا بەو کەسەی کە بێ فەرمانی داك و باوکی بکا یا سلەی رەحمی نەبێ لە گەڵ خزمو قەومی خۆی یا پیاوی تەواو بێ و « زنا » بکا یا بەرگی خۆی درێژ بکا بۆ ئەوە فیز بە سەر عالەمدا لێدا •

## « باسی بەجێ ھینانی رەحم »

پێغمبەر (ص) فەرمویەتی کەسێك باوەرری ھەیە بە خواو پێغمبەرو بە رۆژی قیامەت با سیلەی رەحم بە جێ بێنێ وە کەسێك باوەرری ھەیە بە خواو پێغمبەرو بە رۆژی قیامەت با قسەی باش بکا یا بێ دەنگ بێ پیاوێك ھات بۆ خزمەت پێغمبەر عەرزی کرد چ کردەوەیەك خۆشە ویستە لە خزمەت خوا فەرموی باوەرری کردن بە راستایەتی ئاینی ئیسلام عەرزی کرد لە پاش ئەوە چ گەورەیە فەرموی بەجێ ھێنانی «رەحم» عەرزی کرد چ شتێك لە ھەموو شتێك خەرابترە لە خزمەت خوا فەرموی کافر بوون عەرزی کرد لە پاش ئەو چی‌یە فەرموی قەتعی رەحم عەرزی کرد لە پاش ئەوە چی‌یە خەراپە فەرموی وازھێنان لە ئەمر کردن بە چاکەو نەھی کردن لە خەراپە ، (ابو ذر) کە یەکێکە لە «صحابان» ئەفەرموێ من گەورەی خۆم کە پێغمبەرە وەسی یەتی لێ کردوم بە پێنج خەسڵەت لە چاکەیەکی یان ئەوەیە کە تەماشای لە خۆم دەوڵەمەند تر نەکەم ھەر تەماشای کەمتر لە خۆم بکەم وە ھەم وەسی یەتی لێ کردوم کە ھەژارم خۆش بوێن وە لێ یان نزیك بکەومەوە وە

سیلەی رەحم بەجێ بێنم با بش مرم وە لە خزمەتی خوادا لە کەس نەترسم وە هەر قسەی حەق بکەم با تاڵ بێ و زەرەری خۆشم بێ وە زۆر (لاحول ولا قوة الا باللە) بڵێم چونکە ئەو دوعایە غەزنەیەکە لە غەزنەکانی بەهەشت ، وە فەرمویەتی کەسێك پێی خۆشە کە تەمەنی درێژبێ و رۆزی فراوان بێ با سیلەی رەحم بەجێ بێنێ وەسلەی رەحم ئەوە نیە ئەو سلەی رەحم بەجێ بێنێ تۆش لە جەزای ئەوەدا رەحم بەجێ بێنی بەڵکە تۆ ئەو دەستورەی کە لەگەڵ ئەوشەخسەت بووە بێگانە یە یا خزمە هەر بە جێی بێنە جا چاکە بووە یا دیاری یا کاغەز ناردن بووە یا چوونی کن یەك تر بوە واز لەم دەستورەی خۆت مەیەنە ، لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا کە خوا فەرمویەتی ( یمحو اللە مایشاء ویثبت ) «عولەماء فەرمووویانە وا هەیە کە عومری ئینسان سێ رۆژ ئەمێنێ بە هۆی بەجێ هێنانی رەحم ئەبێتە سی (٣٠)ساڵ وە وا هەیە ئینسان سی (٣٠) ساڵی عومر بە هۆی قەتعی رەحم ئەبێتە سێ رۆژ .

## ( باسی حەقی دراوسی )

خوای گەورەو مهرەبان : فەرموویە « واعبدوا اللە ولا تشرکوا به شیئا وبالوالدین احسانا وبذی القربی والیتامی والمساکین والجار ذی القربی والجار الجنب والصاحب بالجنب » مانای ئێوە ئەمری خوا بەجێ بێنن و بە خوا کافر مەبن و چاکە لە گەڵ داك و باوك بکەن و لە گەڵ خزمو هەتیو و هەژارو دراسێی بێگانەو رەفیقی بێگانە چاکە بکەن پێغمبەر (ص) فەرمویەتی دەربارەی ئاگاداری دراوسێ

(جیران) به دائمی جبرەئیل وەسییەتی لە من کردوە هەتا بیرم وابوو کە دراوسێ میرات لە دراوسی دەگری،وە فەرمویە کەسێك ئیمانی بەخوا رۆژی قیامەت هەبێ با دراوسێ‌خۆی ئازار نەدا با دراوسێکەشی ئەو کەسە ئازار بدا چونکە ئەو خێری خۆی هەیەو ئەویش شەرری خۆی هەیە وە فەرمویەتی ناچێتە بەهەشت کەسێك کە دراوسێی لە بەلاو ناررەحەتی ئەو نەپارێزرێ ، وە ئەی فەرموو ئەو کەسە بە موسڵمانی تەواو ناژمێررێ کە بۆ خۆی تێر بخواو دراوسێکەشی برسی بێ وە ئاگای لە حاڵی ئەو نەبێ ، عەرزی پێغمبەریان‌کرد حەقی دراوسێ لـە سەر دراوسێ چی یە فەرموی حەقی ئەوەیە ئەگەر نەخۆش بوو بچیە لای وە ئەگەر مرد لە گەڵی بچی بو سەر قەبران وە ئەگەر داوای قەرزی لێ کردی قەرزی لە گەڵ بکەی وە ئەگەر رووت بوو بەرگی بۆ بکەی وە ئەگەر سوودی دەست کەوت پیرۆزبایی لێ بکەی وە ئەگەر تووشی نارەحەتی بووسەرە خۆشی لێ بکەی وە بەرزمەکەوە خانووی خۆت بەسەر خانووی دراوسێ دا نەوەك رێگای بای لێ بگری وە ئازاری دراوسێ مەدە بە بۆنی چێشتی خۆت مەگەر بۆی بنێری • یەکێك عەرزی پێغمبەری کرد پێم نشان دە کردەوەیەکی وەها کە پێی بچمە بەهەشتێ فەرموی «محسن» بە مانای چاکە کـەر بە عەرزی کرد بەچی دەرئەکەوێ کە چاکە کەر «محسنم» فەرموی لە درواسێ بپرسە ئەگەر پێ‌یان باش بووی ئەوە لە لای خواش باشی وە ئەگەر ووتیان خەرابی ئەوە لای خواش خەرابی وە پێغمبەر (ص) فەرمویەتی دراسێ سێ جۆرە یەکی‌یان هەر حەقێکی لە سەری ئەوە ئەو دراوسێ یە یەکە «فاسق» و بێ دینە وە یەکی‌یان دوو حەقی لە

سەری ئەوە ئەو کەسەیە کە دراوسێ ئەو پیاوی باشە وە دراوسێ یەك هەیە سێ حەقی لە سەری ئەوە ئەودراوسێ یە یە کە موسڵمانەو خزمە .

## ( باسی قەتل )

خوا فەرمویە « ومن يقتل مؤمنا متعمدا فجزاؤه جهنم خالدا فيها وغضب الله عليه ولعنه واعد لەعذابا عظيما» مانای کەسێك موسڵمانێك بکوژێ بە عەمد جەزای ئەو چوونە ناو دۆزەختە هەتا هەتایی ئەگەر پێی حەلاڵ بێ یا زۆری تێدا ئەمێنێ تەوەکە پێی حەرام بێ ، وە خوا رقی لێ یە وە لە عنەتی لێ ئەکا وە خوا بۆی ئامادە کردوە عەزابێکی زۆر توند ، پێغمبەر «ص» فەرمویەتی خۆتان بپارێزن لە حەوت (٧) گوناە کە ئینسان بە هلاك ئەدەن عەرزیان کرد « یا رسول الله » ئەو گوناهانە چین ؟ فەرموی یەکییان کافر بوونە یەکی یان کوشتنی موسڵمانە بە ناحەق هەتا دوایی « حەدیث» فەرموی، وە فەرموی هەموو گوناهێك نزیکە خوا لێی خۆش بێ الا کافر بوون و قەتڵ نەبێ ، وە کوشتنی موسڵمان لە لای خوا بەرامبەر تەواوی دونیایە ، وە ئەگەر تەواوی ئەهلی ئەرز یەك نەفەر بکوژن وە تۆبەی لێ نەکەن خوا هەموویان لە دۆزەخ ئەخات ، وە کەسێك یارمەتی دان بکا بۆ کوشتنی موسڵمان بە قسەکردن بە خزمەت خوا ئەگات و لە ناو چاوانی نوسراوە ئەوە بێ بەشە لە رەحمەتی خوا ، وە یەکەم شتێك کە لە رۆژی قیامەتدا پرسیاری لێ ئەکرێ وەزعی نوێژە وە ئەو شتەی کە زوو جێ بەجێ ئەکرێ وەزعی کوشتنە ، وە عەزابی دۆزەخ

له حەفتا بەش شەست و نۆ (٦٩) بەشی بۆ فەرمانکەر بە قەتڵەکەیەو بەشتێکی بۆ « قاتلە » ، وە پێغمبەر (ص) فەرمویەتی دێتە دەر لە دۆزەخ ئەستۆیەکی درێژ زمانێکی فەسیحی هەیە ئەڵێ من « مأمورم » کە لەگەڵ خۆم بەرم بۆ دۆزەخ شەخصێکی کە بە کافری مردبێ یا زاڵمێکی توند و تیژ بووبێ یا موسڵمانی کوشت بێ بە ناحەق ئەوانە ئەچن بۆ دۆزەخ لە پێش خەڵکدا بە پێنج سەد ساڵ ، پێغمبەر (ص) فەرمویەتی سبەینان شەیتان تاقمەی خۆی بلاو ئەکاتەوە بە ناو ئەرزدا ئەڵێ هەر کەس ئەم رۆ موسڵمانێك هەڵدێرێ تاجی لە سەر ئەنێم نەفەرێك دێتەوە ئەڵێ فلان کەسم هەڵداشت ژنەکەی تەلاق دا شەیتان ئەڵێ ئەوە هیچ نی یە بەڵکە مارەی بکاتەوە ، یەکی تر دێتەوە ئەڵێ فلان کەسم هەڵداشت کردم بە کافر شەیتان ئەڵێ ئێ تۆ باشە تاجی لە سەر ئەنێ ، یەکێکی تر دێتەوە ئەڵێ من فلان کەسم هەڵداشت «قەتلم» پێ کرد شەیتان ئەڵێ هەرتۆ باشت کرد هەر تۆ باشت کـــرد ئیشی وی پێ لە ئی گشتییان باشترە ، « اجماعی علما » هەیە لە سەر ئەوە کە کوشتنی ئینسانی موسڵمان یا کافرێکی کە لە ژێر « ئەمانی » ئیسلام دابێ لە گوناهی گەورەیە نەك وەکو کافری ئێستا چونکە ئێستا موسڵمانەکان لە ژێر دەستی کافردان ، خوا رەحم بکا لە ژێر دەستی کافران رەزگارمان بکا بۆ خاتری پێغمبەر «ص» آمین •

## ( باسی غەزاکردن )

**خوا فەرمویە « یا ایها الذین آمنوا هل ادلکم علی تجارة تنجیکم** من عذاب الیم تؤمنون باللّه ورسوله وتجاهدون فی سبیل اللّه باموالکم

وانفسكم ذلكم خير لكم ان كنتم تعلمون يغفر لكم ذنوبكم ويدخلكم جنات تجري من تحتها الانهار ومساكن طيبة في جنات عدن ذلك الفوز العظيم واخرى تحبونها نصر من الله وفتح قريب وبشر المؤمنين »
ماناى ئەى موسڵمانینە با پێتان نشان دەم كردەوەیەك كە رەزگارو پكا لە عەزابی توند وە كردەوەكەش ئەوەیە كە باوەرر بكەن بە خواو پێغمبەر وە غەزا بكەن لە رێگەی خوادا بە « صرف » كردنی ماڵی خۆتان و نەفسی خۆتان ئەوە باشترە لە ئیشی تر ئەگەر زانابن ، جا بە واستەی ئەو كردەوە خوا خۆش ئەبێ لە گوناهی ئێوە وە ئەتان با بۆ بەهەشتێك كە خاوەنی داری وایە كەس نەی دیوە وە روباریان بە بندا ئەرروا ، وە جێگەی پاك لە عەیبی تێدایە لە « جنة العدن » دا كە ناوی جێگەیەكە لە بەهەشت وە ئەوەش ئامانجی تەواوە بۆ ئینسان وە نعمەتێكی تر كە پێتان خۆشە ئەویش یارمەتی خوایە و « فتحی » نزیكە ، وە موژدە بدە بەو كەسانە كە برروا هێنەرن ، پێغمبەر «ص» فەمویە من لە لایەن خوا وە فەرمانم پێ كراوە كەشەرر لە گەڵ خەڵك بكەم تاكو ئەڵێن « اشهد ان لا اله الا الله وان محمدا رسول الله» ئەگەر ئەو وتەیانووت ئەوە ئەپارێزن لە من نەفس و ماڵی خۆیان بەس بە حسابی شەرعی نەبێ ئیتر حسابی راستو درۆیان «عائدەی خوایە ، ئەگەر شادەكەیان بە درۆبێ بۆ قیامەت هیچ سوودی نی یە .
وە فەرمویە ئەو كەسە بە غەزاچی ئەژمێررێ كە شەرر لە گەڵ كافران بكا بۆ تە ررەقی ئایینی ئیسلام نەك وەك زەمانی خۆمان كە رونبەی دونیا بێ یا تەماعی ماڵی دونیابێ دیارە ئەو جەزایە كە خوا ئەفەرموێ بۆ ئەو كەسە نی یە پێغمبەر «ص» فەرموویەتی پیاوی

شەهید شەش خەسلەتی باشی هەن : یەکەم ئەوەیە خوا لێی خۆش ئەبێ بە یەکەم دڵۆپە خوێنێك کە لێی ئەکەوێتە خوار ، وە جێگەی خۆی چاو پێ ئەکەوێ لە بەهەشت وە ئەپارێزرێ لە عەزابی قەبر ، وە ئەمین ئەبێ لە ناررەحەتی رۆژی قیامەت ، وە لە سەر سەری دائەنرێ تاجێکی « یاقووت کە بە نرخ ترە لە دونیا و هەرچی تێی دایە ، وە لێی مارە ئەکرێ حەفتاو دوو حۆری وە شەفاعەت ئەکا بۆ حەفتا «٧٠» کەس لە خزمو قەومی خۆی ، وە فەرموویەتی رووحی شەهیدان لە ناو بەدەنی باڵندەی سەوزدایەو هەڵا وەسراون بە « عەررشە » وە ئەگەررێن بە ئارەزوی خۆیان لە بەهەشتا لە پاشان دێنەوە جێگەی خۆیان خوای گەورە خۆیان بۆ دەرئەخاو ئەفەرموێ ئارەزوتان لـــە چی یە ؟ عەرزی ئەکەن ئارەزومان لە چی‌بێ ئێمە بە ئارەزوی خۆمان ئەگەررێین لە بەهەشتا سێ جار خوا وا ئەفەرموێ لە پاشان بۆیان دەرئەکەوێ کە خوا مەبەستی ئەوەیە ئارەزویەك بکەن ئەو جـــار عەرزی ئەکەن پێمان خۆشە روحمان بچێتەوە ناو بەدەنمان بۆ ئەوەی غەزا بکەین و جارێکی‌تر شەهید بکرێین بۆ رازی بوونی تۆ خـــوا ئەفەرموێ وام برریار داوە تازە ئەوە نابێ عەزری ئەکەن کەوابوو وامان پێ خۆشە کە ئەو وەزعەی ئێمە دەرکەوێ بۆ برا موسڵمانەکان جا ئەم جار خوا ئایەتی بۆ پێغمبەر «ص» نارده خوار فەرمووی « ولا تحسبن الذین قتلوا فی سبیل الله امواتا بل احیاء عند ربهم یرزقون فرحین بما آتاهم الله من فضله » مانای بیرتان وا نەبێ ئەوانەی شەهید کراون لە غەزادا کە مردوون بەڵکە زیندون لە خزمەت خوادان و خواردنیان هەیە و کەیف خۆشن بەو ـ نعمە ـ تانەی کە خوا لە

گەورەیی خۆی پێی بەخشیون ، پێغمبەر «ص» فەرمویەتی بەهەشت ئامادە ئەکرێ لە رۆژی قیامەتدا خوا ئەفەرموێ لە کوێن ئەو عەبدانە کە غەزایان کردوە بۆ رەزائی یەتی من ئەو وەختە ئەچن بۆ بەهەشت بە بێ حساب •

# ( باسی زنا )

خوا لە قورئاندا فەرمویە « ولا تقربوا الزنا انه كان فاحشة وساء سبيلا » مانای نزیك مەکەونەوە لە « زنا » چونکە نیشێکی زۆر خەراپە و لە گشت رێگەیەك خەراپترە هەتا دەرکەوتوە کە لە هیچ زەمانێکدا « زنا » حەلاڵ نەبوە ، وە خوا فەرمووێە « الزانية والزاني فاجلدوا كل واحد منهما مأة جلدة ولا تأخذكم بهما رأفة في دين الله ان كنتم تؤمنون بالله واليوم الاخر وليشهد عذابهما طائفة من المؤمنين» مانای ئەو ژنەی کە زنا ئەکاو ئەو پیاوەی کە زنا ئەکا هەر یەکی سەد داریان لێ دەن وە لە « حکمی » خوادا هیچ رەحمییان پێ مەکەن ئەگەر ئێوە باوەررتان بە خواو پێغمبەر هەیەو بە رۆژی قیامەت ، وە با حازری ئەو عەزایە بێ کومەڵێك لە موسڵمانان تاکو ئەوانیش دەرس وەرگرن ، بەلام ئەم حکمە بۆ ژنوو پیاوێکە کە لە هیچ کاتێکدا « جماعی » حەلاڵیان نەکردبێ بەلام بۆ کەسێك کە هەر یەك جار (جماعی) حەلاڵی کردبێ ئەبێ لە ژێر بەردا (رەجم) بکرێ هەتاکو ئەمرێ وەکوو لە ( حەدیثی صحیح) دا هەیە ، عەرزی پێغمبەریان کرد چ گوناهێك لە هەموو گوناهان گەورەترە فەرموی یەکەم کافر بوونە ، عەرزیان کرد لە پاش ئەوە فەرمووی ئەوەیە کە منداڵی خۆت

بکووژی له ترسی نان خواردن وه یا خزمی خۆت بکووژی بۆ خاتری میرات ، عەرزیان کرد پاش ئەوە چیه فەرمووی « زنا » کردن له گەڵ ژنی دراوسێت وه « موافقی شەرع » چل ماڵ له گشت لای خۆت بـــه دراوسێ ئەژمێردرێ ، وه پێغمبەر (ص) فەرموویه ئەو کەسه که « زنا » ئەکا له کاتی زنا کردندا به موسڵمان ناژمێردرێ وه ئەو کەسەش که دزی ئەکا یا شەرراب ئەخواته وه وه هەر وەهایه که ئەو گوناهانەی کردن هەودای ئیمان له ئەستۆی دا نامێنێ جا ئەگەر تۆبەی کرد لـــه دوایدا خوا لێی گیرا ئەکا ، وه هەم پێغمبەر (ص) فەرموویه حەلاڵ نیه کوشتنی موسڵمان که شادەی به خواو پێغمبەر هێنابێ بەس به سێ صورەت ئەبێ یەکی یان ئەوەیه که « جماعی » حەلاڵی کردبێ و له پاشان ( زنا ) بکات ئەو کەسه له ژێر بەردا ئەکوژری ، وه ئەوکەسه که رێگری بکا و ئینسان بکوژێ ئەو کەسەش ئەکوژرێ ، وه کەسێك موسڵمانێکی به ناحەق کوشت بێ ئەو کەسه ئەگەر « عفو » نەکرێ ئەکوژرێتەوه ، وه پێغمبەر (ص) فەرمویه ئەرزو ئاسمان له عنەت ئەکەن لەو کەسەی پیاو و «زنا» ئەکا وه له دۆزەخدا بۆگەنی فەرجی ئەو کەسانه که زنایان کردوه و تۆبەیان نەکردوه ئەهلی دۆزدخ ناررەحەت ئەکا زیاد له ناررەحەتی خۆیان ، وه فەرمویه کەسێك زنا له گەڵ ژنی خاوەن مێرد بکا نیوەی عەزابی ئەو ئومەته له سەر ئەو ژنو پیاوەیه له رۆژی قیامەتداوخوا چاکەکانی ئەو کەسه بۆ مێردی ژنەکه قەرار ئەدا ، وه ئەگەر خاوەنی ژنەکه بزانێو دەنگ نەکات خوا بەهەشتی له سەر حەرام ئەکا چونکه خوا له سەر دەرگای بەهەشتی نووسیوه ئەی بەهەشت تۆحەرامی له ئینسانی

( دیوث ) وە ئینسانی دەیوث ئەوەیە کە بە ئیشی « فاحشە » بزانێ لە ماڵی خۆیدا و دەنگ نەکا وە غیرەتی ئاشکرا نەکا ، وە زانراوە کە کەسێك دەستی لە سەر ژنی حەرام دانا بە ( شهوة ) لە رۆژی قیامەتدا ئامادە ئەکرێ دەستی لە پاش ئەستۆی بەستراون وە ئەگەر ماچی کردبێ لێوانی بە مەقەستی ئاگری ئەبرن وە ئەگەر زنای لـە گەڵ کردرانەکانی شاهدی لێ ئەدەن ئەڵێن ئێمە سواری حەرام بووین جا ئەو وەختە خوا بە چاوی رق تەماشای ئەکا ئەو وەختە گۆشتی دەموو چاوی هەڵئەوەرێ « نزاع » ئەکا ئەڵێ من نەم کردوە ئەم جار زمان شاهدی لێ ئەدا ئەڵی من قسەی حەرامم کردوە وە دەستی شاهدی لێ ئەدەن ئەڵێن ئێمە شتی حەرامن گرتوە وە چاوی ئەڵێ من تەماشای شتی حەرامم کردوە وە لاقی ئەڵێ من بۆ شتی حەرام رۆیشتووم وە فەرجی ئەڵێ من کردومە وە مەلائکەی پارێزگارکەر « حافظ » ئەڵی من بیستومە مەلائکەی تر ئەڵێ منیش نووسیومە ، خوای گەورە ئەفەرموێ منیش ئاگام لێ بوو وە دام پۆشی ، لە پاشان خوا ئەفەرموێ ئەی مەلائکەتی من ئەو شەخصە بگرن با عەزابی من بچێژێ رقم زۆر لێیە چونکە شەرمی لە من زۆر کەم بوو ( اجماعی علما ) لە سەر ئەوەیە کە ( زنا ) کردن لە گوناهی گەورەیە ، وە لە پاش قەتل لە هەموو گوناهێك گەورە ترە ، هەندێک ئەڵێن هەتا لە قەتڵیش گەورەترە وە لە هەموو زنا گەورەتر زنا لە گەڵ دراوسێیە ، وە کەسێك پێی حەلال بێ ئەوە کافرە وە پێویستە بزانرێ هەر وەکو ( زنا ) بۆ فەرج هەیە بۆ چاویش هەیە بۆ قاچیش هەیە ، پێغمبەر (ص) فەرموویە برریار دراوە زنا بۆ ئینسان کە تووشی ئەبێ ، « زنا » ی چاو ئەوەیە کـــە

تەماشای بە حەرامی پێ بکا وە زنای گوێ ئەوەیە گوێ لە دەنگی حەرام راگرێ وە زنای زمان ئەوەیە قسەی حەرام بکا زنای دەست ئەوەیە جوولانەوەی حەرامی پێ بکا زنای قاچ ئەوەیە هەنگاوی حەرامی پێ هەڵ بێنێ زنای دڵ ئەوەیە ئارەزوی شتی حەرام بکا جا ئەمجار فەرج یا بە قسەیان ئەکا یا بە قسەیان ناکا ، وە پێغەمبەر (ص) فەرموویە هەر کەسێك چاوی بە ژن کەوت بە خۆی نەبوو چاوی خۆی نەوی کرد خوا پەیدا ئەکا لە دڵی ئەو کەسەدا « عبادەتێك» کە شیرنایەتی ئەو عبادەتە لە دڵی دا دەر ئەکەوێ و ئەزانرێ مانای ئەوە بۆ کەسێکە کە لە ترسی خوا خۆی بپارێزێ لە نەزەر و چاو لە شتی حەرام نەکا ، وە پێغەمبەر (ص) فەرموویە نەزەرکردن تیرێکە ژەهراوی لە تیرەکانی (شەیتان) کەسێك وازی لێ بێنێ لە ترسی خوا شیر نایەتی « ئیمان » دەرك ئەکا لە دڵی خۆیدا ، وە هەم فەرموویە هەموو چاوێك لە رۆژی قیامەتدا ئەگری بەس چاوێك نەبێ کە خۆی پاراست بێ لە نەزەری حەرام وە چاوێك نەبێ کە بە ئاگا بێ لە غەزادا وە چاوێك نەبێ کە گریابێ لە ترسی خوا ، وە فەرمویە سێ کەس استراحەت ئەکەن و وتوو وێژ ئەکەن بە ئەمینی لە ژێر سێبەری عەررش وە خەڵکی تر لە ناررەحەتی دان ، یەکیان ئەوەیە کە لە بەجێ هێنانی فەرمانی خوادا نەترسێ لە لۆمەی خەڵك وە یەکێك ئەوەیە دەستی درێژ نەکردبێ بۆ حەرامی وە کەسێك تەماشای شتی حەرامی نەکردبێ ، وە لەعنەت کراوە لەو کەسەی نەزەر ئەکا یا نەزەری ئەکرێتێ ، وە پرسیاریان کرد لە پێغەمبەر (ص) دەربارەی نەزەر لە ناکاو فەرمووی چاوی خۆت «منع» بکە زەرەری نییە ، وە فەرموویە هەموو سبەینیان

دوو مەلائکە بانگ ئەکەن هاوار بۆ پیاوان لە بەر ژنان وە هاوار بۆ
ژنان لە بەر پیاوان ، وە فەرمویە خۆتان دوور کەن لە « خلوة » کردن
لە گەڵ ژن سوێند بە خوا هەرکەسێك « خلوة » بکا لە گەڵ ژن قابل
نی‌یە شەیتان ئەکەوێتە مابەینی یان وە ئەگەر بە رانێکی قورراویو
بۆگەنیوت تووش بێ ئەوە باشترە لە وە کە شانت وە شانی ژنی نا
(محرم) بکەوێ ، وە کەسێك بررواییی بە خواو پێغمبەر هەبێ با
( خلوة ) لە گەڵ ژنی نا (محرم) نەکا بەبێ لە کن بوونی «محرم» وە
« ممکن » نی‌یە ئینسان « خلوة » لە گەڵ ژنی نا ( محرم ) بکا
نیازی خەرابی هەیە ، وەرگیراوە لە « ابن سیرین » دررندێك هەبوو
و هەر کەسێك تووشی ئەبوو ئەی کوشت هەتا جارێك پیاوێك هات
چاوێکی کوێر بوو ووتی رێی من کەن چوو بۆ لای ئەو دررندە
دررندەکە سەری نەوی کرد و کوشتی پێیان ووت ئەوە بۆ بۆتۆ
فەرمانبەری کرد ووتی هۆی ئەوەیە کە قەت گوناهم نەکردوە بەس
گوناهێك نەبێ بە چاوە کوێرەم کردوە ئەویشم بە تیرێك دەرهێنا
وەکو ئەی بینن ، وە پێ ویستە بزانرێ کە زنای چاوان ئەوەیە بە
ئارەزو « عمد » تەماشای بەشێکی بێگانە بکەی بالێشی جوێ بێتەوە
وەکوو موو یا نینۆك یا پیرەژن بێ ئەو نەزەرە حەرامە لە سەر پیاو
با ئەمینیش بێ لە خەرابە یا بە « شهوة » نەبێ ،وە حەرامە تەماشای
فەرجی کچی چووك بەس بۆ داکی نەبێ لە دەوری شیردانەدا
و خزمەت کردندا وە حەرامە تەماشا کردنی ژن بۆ پیاو ئەگەر
عەبدیش بێ ، وە حەلاڵە تەماشای فەرجی کووری گچکە لە کاتی
بێ تەمیزی دا وە پێ ویستە لە سەر ژنی موسڵمان خۆ دابۆشێ لە

بەر ژنی « کافر » و ژنی ( فاسقة ) جا فسقه کەی بەز نابێ یـا بـە گەوادی بێ یا بە شتی تربێ ، وە هەرکاتێك حەرام بێ نەزەر حەرامە دەست لێدان با نەزەریش نەکەی وە حەرامە پیاو ئەعزای ژنی (محرم) ی خۆی بگووشێ وەکو خوشك یا داك بەبێ حاجەت وە حەرامە نوستنی دوو پیاو یا دوو ژن بە یەکەوە بە رووتی لەژێر فەررشێکدا وە پێویستە جیاوازی خستن لە مابەینی منداڵی دە ساڵەدا لە گەڵ داك و باوك و خوشکی مانای نێرینە لە گەڵ مێینە نە نۆی بە یەکەوە وە ئەو نەزەرو دەست لێدانە هەر وەکوو لە گەڵ ژن حەرامە لە گەڵ ئەمرەدیش حەرامە یانی شەخصێك نێر بێ و شەیتانی پێ نەکەنی بێز نەمیزی پەیدا کردبێ .

## « باسی جنیودان بە ئینسان »

### پێی بلێی زنات کردوە

خوای گەورە فەرموویە لە قورئاندا « والذين يرمون المحصنات ثم لم يأتوا بأربعة شهداء فاجلدوهم ثمانية جلدة » مانای ئەو کەسانەی کە جنێو ئەدەن بە کەسێك کە زنای « معلوم » نەبێ پێی بلێن زنات کردوەو چوار شاهدیان نی‌یە ، ئەگەر ئەو کەسە « حر » بێ کـە جنێوەکە ئەدا ئەبێ هەشتا داری لێ بدرێ وە ئەگەر عەبد بێ چل داری ئەبێ لێ بدرێ « ولا تقبلوا لهم شهادة ابدا » مانای گیرا ناکرێ شاهدی ئەو کەسانە بۆ خەڵك ئەگەر تۆبەی نەکەن « واولئك هـم الفاسقون الا الذين تابوا من بعد ذلك واصلحوا فان الله غفور رحيم » مانای ئەو کەسانە هەر ئەوان « فاسقن » بەس ئەو کەسانە نەبێ کە

پەشمان بینەوە لە پاش ئەو قسەو چاکەی بکا ئەو وەختە خوا لێی خۆش ئەبێ و روحمی پێ ئەکا ، پێغمبەر (ص) فەرموویە خۆتان بپارێزن لەو حەوت گوناهانەی کە ئینسان بە هیلاك ئەبەن عەرزیان کرد ئەو گوناهانە چین فەرمووی یەکیان کافر بوونە یەکیان سیحر کردنە یەکیان کوشتنی بە ناحەقە یەکیان خواردنی ماڵی هەتیوە یەکیان سووت خواردنە یەکیان هەڵاتنە لە سەفی غەزا یەکیان جنێودانە بە زنی موسڵمان بڵێی « زنا » ت کردوە وە لەو قسە خدرایانەیە کە خەڵك بە زۆری تووشی بوەو ئەبێ ئینسان بە منالی خۆی بڵێ یا بە منالی یەکی تر بڵێ ئەی قەحبە ئەی کورری قەحبە ئەی کورری زناکەر یا بیژوو ئەوقسانە هەموو گوناهی گەورەن هۆی عەزابی دونیاو قیامەتن ، وە دیارە جنێودان بە « زنا » لە گوناهی گەورە «کبیرە» یە ، « واجماعی علما »ی اسلامی لە سەر ئەو قسەیە هەیە .

## « باسە حەرامی خواردنەوەی شەرراب »

خوا ئەفەرموێ « یا ایها الذین امنوا انما الخمر والمیسر والانصاب والازلام رجس من عمل الشیطان فاجتنبوه لعلکم تفلحون » مانای ئەی موسڵمانینە بزانن بە راستی شەرراب خواردنەوە قومارکردنو بوت پەرستیو قومارکردن بە قەڵەم کە دەستووری دەوری کوفر بوە پیسن وە سوەسەی شەیتانە خۆتان لەو کردەوە بپارێزن بۆ ئەوەی کە رەزگاربن و بە ئامانج گەیشتو بن . مانای ئایەت وای لێ دەرئەکەوێ کەسێك خۆی لەو کردەوانە نەپارێزێ

ئەهلی نەجات نی‌یە ، وە پێغمبەر «ص» فەرمووِیە : هەر شتێکی ئینسان بێ عەقل بکا حەرامە وە هەرچی انسان پێ‌ی مەست بێ ئەوە شەررابە وە هەموو شەررابێك حەرامە وە کەسێك شەرراب بخواتەوە نووری ئیمانی لە دڵدا نامێنێ و ئەچێتە دەر هەتاکو تۆبە ئەکا وە کەسێك شەرراب بە هەمیشەیی بخواتەوە بەبێ تۆبە وەکو «عابدی» بوتو سەنەم وایە ، لە پێشدا شەرراب حەڵاڵ بوو بەڵام ئەگەر حەرام کرا وەکو کوفر دانراو ژمێررا ، وە پێغمبەر (ص) یەرمووِیە کەسێك باوەرری بەخواو پێغمبەر هەیەو باوەرری بە رۆژی قیامەت هەیە با دا نەنیشێ لە سەر سفرە یەکی کە شەررابی لە سەر بخورێتەوە ، وە کەسێك قمێك شەرراب بخواتەوە چاکەی سێ رۆژی بۆ نانوسرێ کەسێك پیاڵەیەك شەرراب بخواتەوە «عبادەتی» چل رۆژی بۆ حساب ناکرێ ، وە فەرموی کەسێك بە هەمیشەیی شەرراب بخواتەوە حەقە لە سەر خوا کە لە « نهر الخبال » بی داتێ عەرزیان کرد «نهر الخبال» چی‌یە ؟ فەرمووی کێمو زوخاوی ئەهلی دۆزەخە ، وە فەرمووِیە کەسێك جارێکی شەررابی خواردەوە بە دار لێی بدەن ئەگەر دوو بارە خواردیەوە هەر بە دار لێی بدەن ئەگەر هەر وازی نەهێنا سێەم جارە بیکوژن ، وە خوا حەرامی کردوە شەرراب خواردنەوەو نرخەکەشی وە حەرامی کردوە شتی مندار بوو وە نرخەکەشی وە حەرامی کردوە گۆشتی بەررازو نرخەکەشی ، وە پێغمبەر «ص» دەرحەقی شەرراب لەعنەتی لە دە کەس کردووە ئەو کەسەی ئەی خواتەوە وە ئەو کەسەی ئەی گوشێ وە ئەو کەسەی یارمەتیدان ئەکا وە ئەو کەسەی هەڵی ئەگرێ وە ئەو کەسەی بۆ لای ئەچێ و

ئەو کەسەی ئەی گێرری لە (مجلس) دا وە ئەو کەسەی ئەی فرۆشێ وە ئەو کەسەی حەقەکەی ئەخوا وە ئەو کەسەی ئەی کرری وە ئەو کەسەی بۆی ئەکرەرێ ، « عبداللەی ئیبنی مسعود » «ر» فەرموویەتی ئەگەر ئینسانی شەرراب خۆرەوە مرد دەفنی بکەن منیش بە سەر دارەوە هەلاوەسن لە پاشان قەبرەکە ئاوالە بکەنەوە ئەگەر رووی لە « قبلە » وەرنەگەررابوو من با هەر بە سەر دارەوە بم و لێم گەررێن ، وە حەزرەتی « علی کرم اللە وجهە » فەرمویەتی ئەگەر قەترەیەك لە شەرراب بچێتە ناو بیرێك وە منارەی لێ دروست بکرێ لە جێگەی ئەو بیرە من بانگ لە سەر ئەو منارە نالێم وە ئەگەر قەترەیەك بچێتە ناو بەحرێك و بەحرەکە ووشك بێو گیای لێ برروێ من گیای ئەو جێگەیە ناخۆم ، وە حەزرەتی عومەر «ر» فەرمویە ئەگەر قامکم بچێتە ناو شەرراب نابێ ئەو قامکە لە گەڵ من بێ مانای ئەی بروم ، دیارە شەرراب خواردنە وەیەك قەترەش بێ حەرامە وە لە گوناهی گەورەیە بە « اجماعی علما » وە ئەو کەسە بیخواتەوە ئەبێ حەدی لێ دەر بکرێ مانای چل داری لێ بدرێ ئەگەر « حر » بێ وە ئەگەر عەبد بێ بیست داری لێ بدرێ وە کەسێك پێی حەلاڵ بێ ئەو کەسە کافرە .

## « باسی سویند خواردنی بە درو »

خوا فەرمویە : « ان الذین یشترون بعهد اللە وایمانهم ثمنا قلیلا اولئك لاخلاق لهم فی الاخرة ولا یکلمهم اللە ولا ینظر الیهم ولا یزکیهم ولهم عذاب الیم » مانای ئەو کەسانە کە وە دەست خۆیان

ئەخەن بە هۆی سوێند خواردن ماڵی کەم ئەو کەسانە هیچ پاداشوو سوودیان دەست ناکەوێ لە رۆژی قیامەتدا ، وە خوا قسەیەکی وایان لە گەڵ ناکا پێ یان خۆش بێ وە تەماشایان ناکا بە لوتف ، وە چاکەیان بۆ ناکا ، وە عەزابی توندیان بۆ هەیە ، جا ئەگەر لە سەر ماڵی کەم وابێ هاوار بۆ ئەو کەسانە کە ماڵی زۆر بە سوێندی بە درۆ پەیدا ئەکەن ، وە دوو بارە پێغمبەر (ص) فەرموویە کەسێك سوێندی بە درۆ بخوا بۆ وە دەست گرتنی ماڵی موسڵمانێکی بە خزمەت خوا ئەگات کە خوا رقی لێ هەستاوە لە پاشان بۆ راستی ئایەتی نوسراوی خوێندەوە ، وە دووبارە فەرمویە کەسێك بە دەست خۆ بگرێ ماڵی موسڵمانێك بە سوێندی بە درۆ حەرامە لە سەر ئەو بە هەشت وە پێ ویست ( واجبە ) بۆ وی دۆزەخ ، عەرزیان کرد ئەگەر ماڵەکە کەمیش بێ هەر وایە ؟ فەرمووی ئەگەر لقە دارێکیش بێ هەر وایە ، وە کەسێك سوێندی بە درۆ بخوا با جێگەی خۆی ئامادە بکا لە دۆزەخدا با لە سەر دار سیواکێکی سەوزیش بێ « عبداللەی ئیمامی مسعود » «ر» فەرموویەتی ئێمە سوێندی بە درۆمان لەو گوناهانە ئەژمارد کە کەفارەتی نی‌یە ئەو سوێندە کە ماڵی موسڵمانی پێ وە دەست کەوێ بە ناحەق ، وە پێغمبەر (ص) فەرموویە خوا ئیزنی منی داوە کە خەبەری ئەو کەڵەشێرەتان بدەمێ کە پێی لە خوار هەموو ئەرزەو سەریشی لە ژێر عەررشە ئەڵێ خوایە پاکیو بێ عەیبی بۆ تۆیە عجائب زۆر گەورەی ، خوا ئەفەرموێ ئەو قسە وایە بەلام کەسێ سوێند بە درۆ بخوا من نا ناسێ ( جبیری کورری مطعم ) دە هەزار درهەمی لە کەفارەتی سوێند سەرف کرد و ئەی فەرموو سوێند بە خوای

( کعبە ) ئەگەر سوێندم خواردوە سوێندە کەم راست بوە ، تەنها ئەوەی کە بەخشیم کەفارەتی سوێندە کە بوو ، وە گێررەرا وەتە وە کە ( اشعثی کورری قیس ) لە جیاتی سوێندی خۆی هەفتا هەزاری سەرف کردوە ، وە حکایەت کراوە لە ( ئیمامی شافعی ) رەزای خوای لێ بێ فەرموویەتی لە تەمەنی خۆمدا سوێندم نەخواردوە نە بە درۆ نە بەراست ، دیارە سوێندی بە درۆ حەرامەو لە گوناهی گەورەیە بە ئیتفاقی هەموو ( علما ) بەس لەو جێگایانە نەبێ کە دیار کراون ٠

## « باسی شاهدی دانی بە درو »

حەزرەتی ( ابو بکر ) ئەفەرموێ دانیشت بوین لە خزمەت پێغمبەر (ص) فەرموی خەبەرتان نەدەمی بە گوناهێکی لە هەموو گوناه گەورەتر ؟ عەرزیان کرد فەرموو فەمووی کافر بوون و بێ ئەمری دالکو باوك وئا گادارین شاهدی دانی بە درۆ تا سێ جارانی فەرموو شاهدی دانی بە درۆ لە پێشدا پاڵی دابوەوە لە پاشان هەستا تەشریفی دانیشت هەرئەی فەرموشاهدی دانی بەدرۆتیمەش ئەمان ووت خۆزگایە گوچیدی نەیفەرموبا ، جارێك پێغمبەر (ص) نوێژی بەیانی کرد لە دوایی تەشریفی راوەستاو فەرموی شاهدی بە درۆ وە کو کوفر ئەژمێررێ سێ جاری وا فەرموو لە پاشان ئەو ئایەتەی خوێندەوە ( فاجتنبوا الرجس من الاوثان واجتنبوا قول الزور ) ماناى خۆتان بپارێزن لە شاهدی دانی بە درۆ ، سەرنج بدەن کە کوفرو شاهدی بە درۆ خوا بە یەکەوەی فەرموو ون وە فەرمویە کەسێك شاهدی بدا لە زەرەری موسڵمانێك بە درۆ یا جێگەی خۆی

ئاماده بکا نه دۆزەخدا ، وە کەسێك ون بکا شاهید یەك کە لە لای بێ و شاهدی نەداوە حەقی موسلمانێك بفەوتێ بە شاهدی نەدانی ئەو ئەویش وەکوشاهدی دانی بە درۆیە ، دیارە شاهدی دانـی بە درۆ حەرامە بەلکە لە گوناهی گەورەیە •

## « باسی توبه کردن »

خوا ئەفەرموێ « انما التوبة علی الله للذین یعملون السوء بجهالة ثم یتوبون من قریب فاولئك یتوب الله علیهم وکان الله علیما حکیما ولیست التوبة للذین یعملون السیئات حتی اذا حضر احدهم الموت قال انی تبت الان ولا الذین یموتون وهم کفار » مانای تۆبە یەك خوا برریاری داوە کەگیرای بکا بە گەورەیی خۆی بۆ ئەو کەسانەیە کـە خەراپەیان کردوە بە نەزانین و بێ عەقلی لە پاشان پەشیمان ئەبنەوە بە زویی مانای لە پێش روح دەرچوندا بە کورتی هەتا هۆشی هەبێ تۆبە گیرا ( قبول) ئەکرێ ، هەندێك ئەلێن لە کاتی ساغیدابی وە لە پێش نەخۆشی بێ مردن دابێ ئەوە خوا تۆبە گیرا ئەکا وە خوا هەموو شتێك ئەزانێ و ئاگاداری عاقبەتی هەموو شتێکە ، وە تۆبە بۆ ئەو کەسانە گیرا نییە کە گوناهان ئەکەن هەتا مردنیان بە سەر دا دێتو هۆشیان نامێنێ جا ئەم جارە ئەلێن خوایە ئێستا پەشیمانین ، وە بۆ ئەو کەسانەش گیرا ناکرێ کە بە کافری مردوون تۆبە بۆ ئەو کەسانە سوودی نییەو گیرا ناکرێ ، وە دووبارە خوا فەرمویە ( یا ایها الذین آمنوا توبوا الی الله توبة نصوحا عسی ربکم ان یکفر عنکم سیئاتکم ویدخلکم جنات تجری من تحتها الانهار ) ماتای ئەی ئەو کەسانەی کە

موسڵمانن ئێوه پەشیمان ببنەوه لەو گوناهانەی کە کردوتانه وه بە راستی روو لە خواکەن رەجاتان وابێ کە خوا مەحو ئەکاتەوه گوناهەکانی ئێوەو داخلی بەهەشتێکتان ئەکا کە جۆگاو روباری بە بن دارەکان دا ئەرروا وه ئەو بەهەشته جێگایەکی وایە نە هیچ چاو شتی وای دیوەو نە هیچ گوێ شتی وای بیستوه ، وه دوباره خوا فەرمویه « ومن يعمل سوء او يظلم نفسه ثم يستغفر الله يجد الله غفورا رحيما » مانای کەسێك کردەوەی خەراپی کرد یا زوڵمی لە نەفسی خۆی کرد لە پاشان پەشیمان بوەوەو تۆبەی کرد خوا لە گوناهی خۆش ئەبێ وه بۆی دەرئەکەوێ کەخوا خاوەنی رەحمه ، وه پێغمبەر (ص) فەرمویه خوای گەورەو میهرەبان کەیف خۆشترە بە تۆبەی عەبدی خۆی لە کەسێك کە لە چۆڵو و بیابان دا وولاغی لێ وون ئەبێو هەموو نانوا ئاوەکەشی بە وولاغەکەوەیە لە بەر برسیایەتیو تینوایەتی خەوی لێ ئەکەوێ کە وه خەبەر هات تە ماشا ئەکا وولاغەکەی بە هەموو شتێکەوه لە پشتی سەری راوەستاوه ئەو عەبدە چەند کەیف خۆش ئەبێ خوا زیاتر کەیف خۆش ئەبێ بە تۆبەی عەبدی خۆی ، وه پێغمبەر (ص) فەرمویه ئەی خەڵکینە تۆبەی بکەن چونکە من لە رۆژێدا سەد جار تۆبە ئەکەم ، وه فەرمویه ئەگەر گوناهی ئێوه لە بەر زۆری بگاتە ئاسمان لە پاشان بە راستی تۆبە بکەن خوا تۆبەو قەبووڵ ئەکاو گوناهەکان مەحو ئەبنەوه وه فەرمویه مەلائکەی شانی راست گەورەیە بەسەر مەلائکەی شانی چەپدا ئەگەر عەبدێك کردەوەیەکی باشی کرد پلەی کەم یەك بە دەی بۆ ئەنووسێ ، ئەگەر خەرابەی کرد بیری وابوو مەلائکەی شانی چەپ بی نووسێ مەلائکەی شانی راست

ئەڵێ مەی نووسە تاکو شەش سەعات رائەوەستێ ئەگەر پەشیمان بۆوە بۆی نانوسرێ ئەگەر پەشیمان نەبۆوە ئەوا یەك خەراپەی بۆ ئەنوسرێ ، وە تۆبەی راست ئەوەیە پەشیمان ببیەوەو بپاڕڕێیەوە لە خواو بڵێی من جارێکی تر ئەو گوناهە ناکەمەوە ، وە ئەگەر بە راستی پەشیمان بۆوە وەکو گوناهی نەکردبێ وایە ئەگەر (حق الناس) نەبێ ، وە کەسێك هەر دەوام بکا لە سەر گوناە و تۆبەش بکا وەکوو گاڵتە کردن بە خوا وایە ، وە دیارە تاکو رۆژ لە رۆژ ئاواوە ( مغرب ) هەڵ دێت تۆبە هەرگیرا ( قبوڵ ) ئەبێ ، وە ئینسان ئەگەر گوناهی کرد خاڵێکی رەش لە سەر دڵی پەیدا ئەبێ جا ئەگەر تۆبەی لێ کرد ئەوە دڵی روون ئەبێتەوە وە ئەگەر تۆبەی نەکرد ئەو رەشاییە هەر زیاد ئەکات ئەو وەختە نزیك ئەبێتەوە لە کوفر خوا بمان پارێزێ لە کوفر •

## « ئاگادار کردنەوەیە »

دیارە تۆبەکردن لەگوناە پێ ویست ( واجبە ) جێ بە جێ وەکو نوێژ کردن واجبە تۆبە کردنیش واجبە وە بەس خۆتو خوا نەبێ کەسی تری پێ ناوێ کەسێك دوای بخا دەورێك بە دواخستنەکەش گوناە بار ئەبێ وەکو بە گوناهەکە گوناە بار ئەبێ کەوابوو پێ ویستە تۆبە لە وەش بکا کە تۆبەی دوا خستوە ، جا ئەگەر گوناهەکانی هەموو لە بیربون تۆبە لە هەموویان بکا یەك بە یەك وە ئەگەر لە بیری نەبوون بڵێ خوایە هەر گوناهێکی هەمە ئەوا تۆبەم لێ کرد جارێکیتر نایانکەمەوە ، تۆبە بۆ خۆی بە عبادەت قەرار دراوەو خێری بۆ دانراوە بەڵام مەحو بوونەوەی عەزابی گوناە حەواڵەی خوای خاوەن سەبرو بە رەحمە بە رەحمی خۆی

مەحوی ئەکاتەوە ( انشاء الله) وە مەرجی ئەو تۆبەی کە گوناهان مەحو ئەکاتە وە ئەوەیە بە ( یقین ) نەك بە « ظن » ئەبێ پەشیمان بێتەوە لە کردنی گوناه لە بەر ئەوە کە بێ ئەمری خوایە نەك لە ترسی خەڵك وە بیری وابێ و عەزمی خۆی جەزم بکا کە جارێکی تر نەی کەمەوە بۆ رەزائی‌یەتی خوا وە ئەگەر لە گوناهەکەدا بێ لەو وەختەدا خۆی بێ نێتە دەر وە ئەگەر ماڵی خەڵکی خواردبێ ئەگەر ماڵی هەیەو زولم لێ کراوەکە دیارەو ( معلومە ) بیداتە وە وە ئەگەر زەکاتی لە سەرە بیدا بە موستەحەق ئەگەر زەکاتەکە ما بێ وە ئەگەر نەمابێ بی بژێرێ ئەگەر گەردنی ئازاد نەکەن وە ئەگەر نوێژو رۆژووی لە سەربن دەست بە گێرانەوەیان بکا با زۆریش بن ئەگەر شەرتێکی لەو شەرتانە نەبێ تۆبەکەی راست نی یە وە ئەبێ بە زارو بە دڵ پەشیمان ببێ تەوە وە پێویستە لە تۆبە لە قەتڵ یا لە جنێو دان بە زنا ئاگادار بکا خاوەن حەقەکە و رێگەی بدا حەقی خۆی بەجێ بێنێ ، وە تۆبە کردن لە غەیبەت ئەوەیە ئەوکەسە غەیبەتت کردوە ئەگەر ئاگادار بووبێ خەبەری زانی بێ ئەبێ گەردنت ئازاد بکاوە ئەگەر خەبەری نەزانی بێ دوعا بۆ خۆتو بۆ ئەو بکە بڵێ خوایە لە هەر دوولامان خۆش بی ، خوا خۆش ببێ لەگوناهمان بە گەورەیی خۆی‌و رەحمی خۆی ئامین یا ارحم الراحمین •

## « باسی ترس لە خوا »

خوا فەرموویەتی « وایای فارهبون » مانای ترسو هەر لە من ببێ ، وە فەرموویە « وخافونی ان کنتم مؤمنین » مانای هەر لە من بترسن

ئەگەرخۆتان بە موسڵان ئەزانن ، خوا ئەمری کردوە بە ترس بوون لەخوا وە بێ ویستو مەرجە بۆ ئیمان بۆیە شەخصی موسڵمان پێویستە ترسی لە خوا هەبێ جا بە هێزی باوەرریو بێ هێزی باوەرری ئەو ترسە زیاد و کەمی بە سەردا دێت ، وە پێغمبەر (ص) فەرمویە من لە ئێوە باشتر خـوا ئەناسم وە لە هەمووتان زیاتر لە خوا ئەترسم ، وە دووپارە پێغمبەر (ص) فەرمویە بناغەی عەقڵ ترسانە لە خوای وە خوا فەرمویەتی سوێند بـــە گەورەیی و « جلالی » خۆم من کۆناکەمەوە لە سەر عەبدی خۆم دوو ترسان وەکو ناکەمەوە دوو ئەمینیان ئەگەر لە دونیادا ئەمین بێ مانای لە من نەترسی لە قیامەتدا ئەی ترسێنم وە ئەگەر لە دونیادا ترسی هەبێ لە من قیامەت ئەمینی ئەکەم ، وە پێغمبەر (ص) فەرمویە ئەگەر وە یـەك هات پێستی عەبد لە ترسی خوا گوناهی لێ هەڵ ئەوەرن وەکو هــەڵ وەرینی گەڵا لە داری بێ هێز ، وە حەزرەتی (حسن) فەرموویەتی ئینسان هەیە گوناه ئەکا بەلام ئەترسێ لەم گوناهە لە بیری ناچێتەوە ئاخری خـوا ەی باتە بە هەشت ، ( کعب الاحبار ) فەرمویەتی پیاوێك هەبوو لە « بنو اسرائیل » دا گوناهێکی کردبوو هەر ئەهاتو ئەچووەی ووت خوا بەچی رازی بکەم لە خۆم لە دوایدا لە پەرراو « دەفتەر » ی خوادا نوسرا بە دۆستێك لە دۆستەکانی خوا ، وە ترسان لە خوا ئینسانی تووشی هەموو چاکەیەك ئەکات ، پرسیار لە ( ابن جبیر ) کرا ترس لە خوا چۆن ئەبێ ؟ فەرمووی ئاوا ئەبێ کە ترسەکە بکەوێتە مابەینی خواو تۆ هەتاکو لە بەر ترسە کەگوناهەکەت پێ نەکرێ ، (عبداللەی ئیمامی مسعود) فەرمویە پیاوی موسڵمان وەها تەماشای گونا ئەکا پێ‌ی وایە لە بن کێوێك دانیشتوە ئەترسێ بە سەریدا برروخێ وە پیاوی بێ دین وائە تەماشای گوناه ئەکا

پێی وایە مێش بە سەر چاوپدارائەبری ماناى ترسی نی یە لە کردنی گوناهەکە ، « عقبەی کوڕی عامر » پرسیاری لە پێغمبەر کرد ڕەزگاری بەچی پەیدا ئەبێ ؟ فەرموی ئاگاداربە لە سەر زمانی خۆت و بگری لە سەر ئەو گوناهەی کردوتە ، وە فەرمویەتی ناچێتە دۆزەخ کەسێك لە ترسی خوا گریابێ وەفرمێسکی ڕشت بێ وە کۆ نابێتەوە تۆزی ڕێگەی غەزاو دوو کەڵی دۆزەخ ، وە پێغمبەر (ص) حسابی کرد لەو حەوت کەسانە کە لە ژێر سێبەری عەرش دا ئەبن لە ڕۆژی قیامەتا کە هیچ سێبەری تێدا نی یە بەس کەسێك نەبێ کە خوا ڕەحمی پێ بکا ئەو کەسەی کە گەورەیەکی دادپەروەر « عادل » بێ ، وە تازە عومرێك کە لە عبادەتی خوادا پێگەیشت بێ ، وە دوو کەس کە لە بەر خوا یەکتریان خۆش بوێ ، وە پیاوێك ژنێکی جوان داوای گوناهی لێ بکاو ئەویش بڵێ من لە خوا ئەترسم ، وە کەسێك خێر بکا بە وونیو کەس ئاگای لێ نەبێ ، وە کەسێك دڵی بە مزگەوتەوە بەسترابێ ، وە کەسێك یادی خوا بکاو فرمێسکی بە چاودا بێتە خوار لە ترسی خواو ئەو گوناهەی کە بە سەری دا هاتوە ، « عبداللەی کوڕی عەمری عاص» فەرمویە ئەگەر فرمێسك لە ترسی خوا بڕێژم پێم خۆش ترە لە وە کە سەد لیرە بکەم بە خێر ، وە « کعب الاحبار » فەرمویە سوێندم بەم کەسە کە ڕووحی منە بە دەستە ئەگەر بگریم لەترسی خوا تاکو فرمێسکم بە لاچاوا دێتە خوارێ پێم باشترە لەوە بە قەدەر کێوێك زێرر بەخشم « عەروفی کوڕی عبداللە »فەرموویەتی خەبەرم زانیوە هەر جێگەیەك لە لەشی ئینسان فرمێکسی وێ بکەوێ ئەو جێگەیە ئاوری دۆزەخی توش نابێ وە خوا حەرامی ئەکا لە ئاوری دۆزەخ ، وە حەزرەتی « ابو بکری صدیق » شەخصێك بوو هەر کاتێك کە

قورئانی ئەخوێند خۆی پێ رانەئەگیرا دەستی ئەکرد بەگریان ،
وە حەزرەتی « عمر » دووخەتی رەش لە سەر رووی پەیدا ببوون لــە
بەرگریان وە حەزرەتی« ابو بکری صدیق» ئەی فەرموو خۆزگایە
کومن موویەك بام بە سینگی موسڵمانێکەوە ، وە حەزرەتی « عمر » لە
کاتی وەفاتیدا ئەی فەرموو هاوار بۆ « عمر » ئەگەر خوا لێی خۆش
نەبێ ، وە « عبداللەی ئیمامی عباس» لە ترسی خوا ئەگریا هەتا وای
لێ بە سەر ئەهات کە ئەت ووت کوندەی رزیوە •

« سەفیانی ئەوری » لە وەختی وەفاتدا دەستی کرد بەگریان پێ
یان ووت تۆ هێندەت گوناه هەن وا ئەترسی ؟ سەری بەرزکرد ووتی
هەرگوناهێکی هەمە پێم بە قەدەر مستێك گڵ نابێ بەلام لە ترسی سەلبی
ئیمان وا ئەترسم و ئەگریم ، « سەهل » فەرموویە لە خەودا دیم کە
چوم بۆ بەهەشت سێ سەد پێغمبەرم چاو پێکەوت لێم پرسین لە
دونیادا لەچی زۆر ئەترسان فەرموویان لە دوایی خەراپ « سوء
خاتمة » لە هەمو شتێك زیاتر ئەترسایین کەوابوو پێ ویستە داوای
ئاخر چاکی بکەین وە پەنا بگرین بە خوا لە ئاخر خەرابی وە ئاخری
عومرمان لە سەر ئیمان و تۆبە کردن بێت ، جارێکی پێغمبەر «ص»
تەشریفی هەڵسا لەو کاتەدا کە ئە و ئایەتەی بۆ هاتە خوار « وانذر
عشيرتك الاقربين » لە بەر ترسی خوا فەرموی ئەی کۆمەڵی قوورەیش
ئەم رۆ نەفسی خۆتان لە عەزابی خوا رەزگار بکەن بە کردە وەی
باش من لە خزمەت خوا ئێوە بێ احتیاج ناکەم ئەی «بنی عبدی مناف»
ئێوە بێ احتیاج ناکەم لە خذمەت خوا بۆ هێچ شتێك ئەی عباسی
مامی «رسول اللە» بێ احتیاجت ناکەم بۆ هیچ شتێك ئەی « صفیە »ی

بووری (رسول الله) بێ احتیاجت ناکەم بۆ هیچ شتێك لە خزمەت خوا ئەی «فاطمە»ی کچی پێغمبەر (ص) داوای ماڵم لێ بکە هەرچەندی پێویستە ئەتدەمێ بەڵام بێ احتیاجت ناکەم لە خزمەت خوا بۆهیچ شتێك ، پێغمبەر (ص) لە حەزرەتی «جبرەئیلی» پرسی بۆچی قەت نابینم کە «میکائیل» پێ بکەنێ ؟ فەرموی لەو کاتەوە دۆزەخ دروست کراوە میکائیل پێ نەکەنیوە وە منیش چاوم ووشك نەبۆتەوە لە ترسی ئەوە نەوەك گوناهێك بکەموبێ ئەمری یەکی خوا بکەم و بم خەنە ناو دۆزەخ ، جا ئەگەر ئەم وزعە حاڵی پێغمبەرانو پیاو چاکان بێ و حاڵی مەلائکەتان بێ کە پاکن لە گوناهان ئەبێ چۆن بێ حاڵی ئێمەو ئەوانەی وەك ئێمە لە ناو خەڵکدا کوا گریان لە بەر دەوام کردن لە سەر ئەم هەموو گوناهانە ، خوایە داوا ئەکەم لــە تۆ کە ترسم پێ بەخشی لە سەر کردنی گوناهان ، وە موفقمان بکەی بۆ تاعەتێکی وا کە رزامەندی تۆی تێدابێ وە تاکو قەبووڵی تۆبە بکەین لە ترسی تۆ ، ئەی ئەو کەسەی دڵی هەموو کەسێك لە دەستی تۆ دایە دڵی ئێمە بهێڵیەوەو قایمی کەی لە سەر ئیمان و لە سەر کردنی کردەوەی باش •

## « تەواو کردن بە تکاو پاررانەوە لە لوتفی خوا »

خوا فەرموویەتی « قل یا عبادی الذین اسرفوا علی انفسهم لاتقنطوا من رحمة الله ان الله یغفر الذنوب جمیعا » مانای بڵێ ئەی « محمد » ئەی عەبدەکانی خوای کە لە ئەندازە بە دەر **گوناهتان** کردون تەما برر مەبن لە رەحمەتی خوای بە راستی خوا لوتفی زۆرە

پیێی ئەکرێ لە هەموو گوناهان خۆش بێ ، پێغمبەر «ص» فەرمویەتی
خوا پێ باکە هەر بۆ خۆی غەفورو رەحمە ، «محمدی» کورری
حەزرەتی «علی» ئەی فەرموو ئێوە ئەی ئەهلی عێراق ئەڵێن
رەجاترین ئایەت کە دڵی ئینسانی پێ لەقوورئاندا ئەو ئایەتەیە کە
نوسراوە بەلام ئێمە کە ئەهلو بەیتی پێغمبەرین ئەڵێین جێگەی رەجا
لە قورئاندا ئەو ئایەتە یە کە خوا ئەفەرموێ « ولسوف یعطیك ربك
فترضی » مانای لە مەو دوا کە رۆژی قیامەتی خوا دەرەجەی
شەفاعەتت ئەداتێ و رازی ئەبی وە دەریای رەحمی خواو رەحمی
پێغمبەر وای پێ ئەوێ کە شەفاعەتی تەواو بۆ ئەمەتی خۆی بکا ،
وە پێغمبەر «ص» فەرمویە لە کاتێکدا کە خوا خەڵکی تەواو
دروست کرد کتێبێکی نوسی لە خزمەت خۆی دانا لە ژوور عەررشەوە
کە رەحمەتی من وە پێش رقی من کەوتوە ، وە خوا فەرمویە من
لە لای بیری عەبدی خۆمم کە بە منی هەیە بیری چاکەی هەبێ
ئەوە باشی بۆ ئەکەم وە ئەگەر بیری خەراپی هەبێ بۆ ئەکەم ، وە
فەرمویە خوا ئەمری کرد بە عەبدێك کە بی بەن بۆ دۆزەخ وەختێك
گەیشتە سەر لێوی دۆزەخ عەبدەکە ئاورری داوە ووتی خوایە مـن
بیری رەحمی تۆم بوە بە رامبەر بەخۆم خوا فەرموی بی گێررنەوە
چونکە من لە سەر بیری باشی عەبدی خۆم بە رامبەر بە خۆم ، وە
دووبارە رەحمی خوا قەرار دراوە بە سەد ١٠٠ بەش لەو سەد بەشە
بەشێك کەوتۆتە ناو ئەجنەو ئینسان و زیندەوەرو دررندە بەو یـەك
بەشە رەحمیان لە گەڵ یەکتر هەیە وە ٩٩ نەوەدو نۆ بەشیش لـەم
رەحمە هەڵی گرتوەو دوای خستوە بۆ رۆژی قیامەت کە رەحمی بە

عەبدی خۆ بکا خوایە لەم رەحمە زۆرەی خوت بێ بەشمان نەکەی ، وە پێغمبەر (ص) وەختێك تالآنی یان بۆ خزمەت هێنا «جاریەکی» لە ناو دا بوو مەمکی شیری زۆر تێدا بوو چاوی بە منداڵێك کەوت کە منداڵی خۆی بوو گرتی و بە خۆیەوە گووشیو شیری دایە لـەم وە ختەدا پێغمبەر (ص) فەرموی پێتان وایە کە ئەم ژنە لە گەڵ ئەم رەحمی خوی ئەم منداڵەی خوی لە ئاگر باوێ ووتیان شتی وا نابێ فەرموی دەنا خوا زۆر بە رەحم ترە لەو ژنە لە حەقی عەبدی خـۆی لەم ژنە بۆ منالی خۆی ، وە دووبارە جارێك پیاوێك هات بو خزمەت پێغمبەر (ص) شتێکی لە دەست دابوو پێ چابوویەوە ووتی «یارسول الله» رابردم بە لای دارێکدا گوێم لە دەنگی جووجەڵەی دەعبایەك بوو جووچکەی دەعبایەکەم گرتن دایکەکەیان هات بۆلام هەرچەند بەربەە کانیم کرد هەر دەوورەی جووجەڵەکانی ئەدا ئەویشم گرت گشتم پێچانەوەو ئەمانە هەون کە لە گەڵ منن فەرموی دایان بنێ دام نان دایکە تەیان لە جوچکە کان جیا ئەئەبۆوە ، پێغمبەر «ص» فەرموی عەجائب ئەمێنن لە رەحمی داکی ئەم بێچوانە بو بێچوەکانی خۆی ؟ سوێند بەم کەسە کە منی کردوە بە پێغمبەر خوا خاوەن رەحم‌ترە دەرحەق بە عەبدی خۆی دوایی فەرموی بیان بەوە بۆ ئەو جێگایەی کە لە وێوە هێناوتن منیش بردنمەوە ئەو جێگایە ، وە پێغمبەر (ص) فەرمویە خوا ئەفەرموێ ئەی بەنی ئادەم ئەگەر تۆ دوعا من بکەیو لە بـەرم وە باررێ یو رەجـام لێ بکەی لێت خـۆش ئەبم وە باکم نی‌یە ، ئەی بەنی ئادەم ئەگەر گوناهی تۆ بگاتە نزیك ئاسمان لە پاشان لێم بپاررێیەوە لێت خۆش ئەبم ، ئەبم ، ئەی بەنـی

ئەگەر پرری ئەرز گوناهت هەبێ لە پاشان پێیە لای من و لێم بپاررێتەوە منیش پرر ئەرز رەحمەتت بە سەردا ئەرریژم وە لێت خۆش ئەبم ، وە پێغمبەر (ص) فەرموی ئەگەر ئارەزوتان هەیە پێتان ئەڵێم یەکەم قسەیەك کە خوا بە موسڵمانان ئەفەرموێ لە رۆژی قیامەتدا وە یەکەم قسەیەك کە عەبد ئەیلێ لە خذمەت خوادا خوا ئەفەرموێ ئایا پێتان خۆشە چاو بێ کەوتنی من ؟ عەرزی ئەکەن بەلێ خوا ئەفەرموێ بۆچی ؟ عەرزی ئەکەن چونکە رەجای لیبوردنی تۆو « لقای » تۆمان بوە خوا ئەفەرموێ ئەوە واجبم کرد « عفو » و لێ خۆش بوونی خۆمو ( لقای ) خۆم ، جا بێ ویستە ئێمە بلێین وە بە دڵێکی ساف و ساغ بپاررێی نەوە کە ئێمە رەجای لێ بوردنو لێ خۆش بوونو ( لقا )ی تۆمان هەیە وە پەنا ئەگرین بە رەحمی تۆ لە رقی تۆ وە بەنا ئەگرین بە عەفوی تۆ لە عەزابی تۆ ، ئەی خوایە ئیمە داوا ئەکەین لە تۆ کە ئاسوودە بین لە دونیاو قیامەتا وە لیمان نەستێنیەوە ئەو نعمەتەی کە ئیمانەکە پێت بەخشی وین وە دڵ ماز رەش نەکەی لە پاش ئیمان وە موفەقمان بکەی بۆ ئەو کردەوە کـ رەزائیەتی تۆی تێدا بێ وە نەگێرری زانینی خۆمان بە زەرەر بۆ ئێما وە حەشرمان بکەی لە گەڵ ئەو کەسانە کە نعمەتی خۆت داوێ وەکوو پێغمبەرو خۆشەویستو شەهیدو پیاو چاك بن وە ئەمنیز بکەی لە ناررەحەتی رۆژی قیامەت وە سێبەرمان لێ بکەی لە ژێـر سێبەری عەررش دا لە رۆژێکدا کە هیچ سێبەرنین بەس سێبەری تۆ نەبێ وە بە نسیبمان بکەی بەهەشت بەبێ حساب وە تەماشا کردن بۆ زاتی گەورەی خۆت سبەینەو ئێوارە ، (وصلی الله علی سیدنا محمد

النبي الامي وعلى آله وصحبه وسلم واخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمين ) •

تەواو بوو وەرگێران ( ترجمە )ی (ارشاد العباد) بەسووورەتی کورت کردنەوە تاکو بۆ برادەران عاجزی پەیدا نەبێ لە سەر داخوازی برای بە رێزم (حارس عبدالله) تکا لە برایەکانی دینی ئەوەیە هەرکەس کە تەماشای کردو رەخنەی لێگرت بە چاوی (مرحمة) بی پۆشێ وە کۆشش لە چاك کردنی بکا وە بە دڵێکی پرر لە سۆزەوە دوعامان بۆ بکا ، ( وصلى الله على سيدنا محمد ) تأریخی تەواوبوونی ئەو نوسراوە •

حسن خلق

في حسن الخلق

ان يكون الانسان

[illegible] --- قليل الاذى --- كثير الصلاح --- صدوق اللسان

[illegible] الكلام --- كثير العمل --- قليل الزلل ---

[illegible] --- برا --- وصولا --- وقورا ---

[illegible] --- رضيا --- حليما --- رفيقا --- عفيفا ---

[illegible] --- لا لعانا ولا سبابا --- ولا نماما ولا مغتابا ---

[illegible] ولا حقودا --- ولا بخيلا --- ولا حسودا ---

[illegible] --- هشاشا --- يحب في الله ويبغض في الله

--- ويرضى في الله ويغضب في الله

# ناوەرۆک ( فهرست )

| الصحيفة (لاپەرە) | بابەت ( الموضوع ) |
| --- | --- |

تەواوبو چاپی سیهـەم بـە سەرپەرشتی مـام وستا علی محمـود پشدەری ، قندۆلی .

نرخی ( ــ ر ٢ دیناره )

له تموزی ١٩٩٠ م　　　　مانگی قوربانی ١٤١٠ هـ

